دل را به جز با یاد خدا شاد مکن - با یاد وی از کس دیگری یاد مکن
دل خانه ی کعبه است ویران مگذار - ویرا به جز از یاد وی آباد مکن

## کوردی

بـــۆ غـــەیری خـــودا ئـــەم دڵـــە قـــەت شـــاد مەکـــە
یـــادی لـــە دڵـــت بـــۆ کەســـی بـــەر بـــاد مەکـــە
وەک کەعبەیـــە دڵ حەیفـــە کـــە وێرانـــی کـــەی
بـــۆ ئـــەو نـــەبێ ئـــەم کەعبەیـــە ئابـــاد مەکـــە

(شەڕافەت)

# چوارینەکانی

# پیری خوراسان

## شێخ ابوسعید ابوالخیر

دیوانێکی تەواو عیرفانی، ئەدەبی ، ئەخلاقی.

وەرگێڕ: ئەلف شەڕافەت

** ** ** ** **

انتشارات شاری شنو

سرشناسه : ابوسعید ابوالخیر، ۳۵۷- ٤٤٠ ق .
عنوان قراردادی :رباعیات . کردی
عنوان و نام پدیداور :چوارینەکانی پیری خوراسان/ابوسعید ابوالخیر وەرگیر ئەلف شەرافەت.
مشخصات نشر :اشنویه:شاری‌شنو،۱۳۹٦.
مشخصات ظاهری :۳۲۵ص.؛۱۴/۵×۲۱/۵س.م
شابک :۹۷۸-٦۰۰-۷۵۷٤-۲۸-۷
وضعیت فهرست نویسی :فیپا
یادداشت :کردی.
یادداشت :کتابنامه
موضوع :شعرفارسی- قرن۵ق. ترجمه شده به کردی
موضوع :Persian poetry -- 11th century -- Translations into Kurdish
شناسه افزوده :شرافت، اسد ۱۳۳۶ مترجم
رده بندی کنگره :PIR۴۵۵۴/ر۲۰۳۸۷۱۳۹۶
رده بندی دیویی :فا۲۲/۱۸
شماره کتابشناسی ملی :۵۰۳۴۶۶۵

---

**ناشر: انتشارات شاری شنو**

**استان: آذربایجانغربی شهرستان اشنویه**

**تلفن: ۰۰۰۵ ۴۴۶۳ ۰۴۴ همراه: ۰۹۱۴۱۶۶۴۱۱۸**

---

**ناوی کتێب : چوارینەکانی پیری خوراسان.**
دانەر : شێخ (ابوسعید ابوالخیر).
وەرگێڕ : ئەلف ـ شەڕافەت.
پیت چنین : سروە واژی.
ئامادەکردنی : سید محمد صادق واژی.
تەڕڕاحی جڵد : صابر حاجی معرووفی.
تـیراژ : ۱۰۰۰ نوسخە.
نۆبەی چاپ : هەوەڵی ۱۳۹۷ هەتاوی.
چاپ و سەحافی : شنۆ - چاپەمەنی ئاریا.
قیمەت : ۲۲۰۰۰تومەن - ۱۵۰۰۰ تومەن.

شمارە شابک: ۷ـ ۲۸ـ ۷۵۷۴ـ ۶۰۰ ـ ۹۷۸
ISBN - 978 - 600 -7574 -2 8 - 7

# سەرەتا

ڕۆژی دووشەممە ١٧ی خەزەڵوەری ١٣٩٥ی هەتاوی، بەرابەر لەگەڵ ٧ی نوامبری٢٠١٦ی زایینی، لە شاری ورمێ دەگەڕام، بە عادەتی جاران سەردانی کتێبفرۆشەکانم کرد. کتێب فرۆشێکی برادەرم بە ناوی (حامد) خاوەنی کتێب فرۆشیەک لە چوار ڕێیانی سیروس، چەند کتێبیکی کوردی دەستی دووی کڕیبۆوە و لە ناویاندا جڵدی ٢ی بەرهەمەکانی ( پیرەمێرد )ی ڕەحمەتی نەمر، کە برای خۆشەویستم (ئۆمێد ئاشنا ) کۆی کردبۆوە و لە ساڵی ٢٠٠١ لە چاپخانەی ئاراس لە هەولێر، لە چاپی دابوو کەوتە بەر چاوم. کتێبەکانم کڕی وگەڕامەوە ماڵی خۆمان، دوای چەند ڕۆژێک کتێبەکەی پیرەمێردم دەخوێندەوە لە ناکاو چاوم بە چەند شێعری بە تام و سەرنج ڕاکێش کەوت.

شـــێعرەکان لە باری مەعنا و موحتەوا زۆر پڕ و قووڵ و بەتام بوون، بە جۆرێک مچوڕک بە لەشـــم دا هات، شـێعرەکان شـێعری شـاعیر و خواناسـی بە ناو بانگی سـەدەی چوار و پێنجی ئێرانی شـێخ (ابوسـعید ابوالخیر) بوون .

من خۆم زیاتر لە٣٧ساڵ بوو دیوانی شێعری ئەم شاعیرەم لە کتێبخانەکەی خۆم دا هەبوو، کە نووسەرێکی ئێرانی بە ناوی ( سەعید نەفیسی )لە ساڵی١٣٣٤ی هەتاوی لێرولەوێ کۆی کردبۆوە و بەبۆنەی پێنجەمین سـاڵی کۆچی دوایی خوالێخۆشبوو(سعید نفیسی )دکتۆر(محمددبیرسیاقی ) لە سـاڵی١٣٥٠ی هەتاوی دووبارە لە چاپی دابۆوە. بەڵام من هیچکات وەک ئەو شەوەی کە کتێبەکەی پیرەمێردم خۆێندەوە سەیری چوارینەکانی (ابوسعید ابوالخیرم) نەکرد بوو.

هەستام کتێبەکەم دیتەوە و دەستم کرد بە خوێندنەوەی چوارینەکانی ئەم خواناسە.

ئەمجارە شـێعرەکانی (ابوسـعید) بە تەواوی سـرنجی منیان ڕاکێشـا و شـێت و شـەیدای شـێعرەکانی بووم و

(ابوسـعید) گوتەنی پەتکیان لە ئەسـتۆ کردم و منیان بە دوای خۆ دا ڕاکێشـا، (ابوسـعید) لە یەکێك لەچوارینەکان لە بابەت عیشقی خودایی دەڵێت .

ڕۆژێکی هـەڵاتم لـەغـەمی دەردی تۆ
ویســتم کە ڕەهابم لەغەمی عەشــقی تۆ

عەشـــــقی تۆکە هات لە نیوە،ڕێی پێ گرتم
وەك جانی لە ئەستۆمی کرد زنجیری تـــۆ

**فارسیەکەی:**

**بگریختم از عشق تو ای سیمین تن**

**باشدکه ز غم باز رهم مسکین من**

**عشق آمد و از نیمه رهم باز آورد**

**مــاننده خــونیان رسن در گردن**

***(ئێستا بزانین پیرەمێرد و ئەبووسەعید چ پێوەندیان پێکەوە هەیە. )***

پیرەمێردی نەمر لەکۆتاییەکانی شـــــەڕی دووەمی جیهانی٦٥چوارینەی ئەبووســـەعیدی لێر و لەوێ دەســـت

کەوتووە و کردوونی بە کوردی، زۆریش بە دوایانەوە گەڕاوە تا بەڵکوو بتوانی کۆیان کاتەوە و هەر هەموویان بکا بە کوردی، زۆریش بە ئارەزوو بووە شـــێوەی ئەدەبیاتی کۆنی فارسـی بە تایبەتی شـێوە ئەدەبیاتی ئەبووسـەعید بخاتە نێو زمان و ئەدەبیاتی کوردی.

بەڵام بەداخەوە کات ومەرگ ئەم فرسەتەی پێ نەداوە، چونکە لە زەمانی ئەو، چوارینەکانی ئەبووســـەعید نە کۆ کرابوونەوە،نە لە چاپ درابوون، بەڵام هەشت ساڵ دوای شەڕی جیهانی دووەم واتە: لە ســاڵی١٣٣٤بەڕێز (ســعیدنفیســی ) بە دوایــان دا دەگــەڕێ و ســــــەرچــاوە و کتێبــە کۆنــەکانی کتێبخانەکانی ئێران لە ســــەنگ و ســــووژن دەدا و ٧٢٠ چوارینە لێر و لەوێ کۆ دەکاتەوە و لە چاپیان دەدا، کە ئەو دەم پیرەمێردی ڕەحمەتی نەمابوو و فەوتی کرد بوو.

دواتر لە ١٣٥٠ دووبارە لە چاپ دراوەتەوە.

وە من لە ڕووی نوســـخەی چاپی ســـاڵی١٣٥٠ئەم چوارینە بە نرخانەی ئەبوو سەعیدم کردوون بە کوردی.

پیرەمێردی نەمر بۆ ئەو٦٥چوارینەی وەریگێڕاون، پێشەکیەکی بچکۆلانەی بۆ نووسیون، ئێستا لێرە دا عەینی پێشەکیەکەی پیرەمێرد دەخەمە پێش چاوی ئێوەی خۆشەویست: (لە زمانی خۆی و بە قەڵەمی خۆی).

(**پێشەکیەکەی پیرەمێرد بۆ ٦٥ چوارینەکانی شێخ ئەبوو سەعید**)

((زۆر دەمێك بوو ڕوباعیاتی شێخ ئەبووسەعیدی (ابو الخیر)م لەم لاو لەو لا ئەبیست، یا لە هەندێ گۆشەی بەیاز و کەشکۆڵەکاندا بەرچاوم ئەکەوت.

لە دوو سێ جیرەتەوە، تەئسیری ئەکردە دڵمەوە، جارێ لە نوقتەی ئەدەبیاتەوە، هەندێ نوقتەی وای تیایە من لە هیچ شاعیرێکی ترم نەبیستووە. دوای ئەوە هەندێ موناجاتی هەیە، سەرانسەر مەعنەویات و ئیلاهیاتە، کە ئەگەر کەسێ بە دڵ و دەروونێکی پاك بیخوێنێتەوە لە بارەگای خوادا، دەنگ ئەداتەوە وفریشتەکانی عالەمی باڵا ئەبنە هاوناڵە و هاودەنگ، لەبەر ئەوەیە کە دەستەیەك لە ئەهلی ئیمان بۆ هەر مەرامێکی دنیا بێ، ڕوباعیەکی ئەویان داناوە کە ئەگەر ئەوندە جارە بیخوێننەوە خواستیان دێتە دی، ئەم نەوعە زاتانە کە وا لە پەردەی پەنهانیدا زوهد و تەقوا و لە دوایدا ئیرشاد ئەکەن، مەسلەك و ڕا و تەریقەتی موختەلیفەیان هەیە کە هەر یەکە بە ناوێك ناو ئەبرێن.

مەزهەبی ئەبووسەعید سۆفی بووە کە لە ئەبی لفەزلی کوڕی حەسەنی شاگردی ئەبی نەصری سەراجی وەرگرتووە.

ئەویش ئەچێتەوە سەر (جنید)ی بەغدادی. بەڵێ ئەم نەوعە پەرستشە چونکە پەنهانییە و پێی ڕاستی شەریعەتی ئیسلامیش ئاشکرایە، خەڵك لەو مەعنەویاتەی (تصوف)ە ناگەن. نەشارەزان، زۆرتر بە(زندیق)یان ئەژمێرن. تەنانەت شێخ ئەبووسەعیدیشیان بەوە ئیتتیهام کرد و لای (مەحموودی غەزنەوی) شکایەتیان لێ کرد، کە ئەمە لەسەر ڕێگای شەرع ناڕوا و ئەمیش گوایە بە ئەبوعەلی ئیبنی سینای وتووە کافرە و ئیبنی سیناش بەو ڕوباعییە مەشهوورە جوابی داوەتەوە، کە لە ئەدەبیاتی فرسدا شێوەی (رباعی) چوار خشتەکی زۆر بەسەندە، لە ڕوباعیاتیشدا دوو زات لە پێش هەموو شاعیرەکانەوەن. شێخ ئەبووسەعید و عومەری خەیام. ئەوڕووپایی زۆرترین ئەدیبەکانی ئینگلیز ڕوباعییاتی خەییامیان لە لا پەسەندترە. کە بە هەموو زمانێ تەرجەمە کراوە. بەڵام لە عالەمی ئیسلامدا دیارە شێخ ئەبووسەعید پێشترە و قیاسی لەگەڵ خەییامدا ناکرێ، ئەم بە هەموو مەعنایەکەوە پیاوی خوا و پیری تەریقەت بووە. چواردە ساڵ بە جەزبەی(فنا فی الله) وە لە دەشت و بیابانی خاوەراندا بەناڵەی مەحەببەتی ئیلاهییەوە سەحرا نەوەرد بووە و بە گژ و گیا ژیاوە.

ڕوباعیاتەکانی هەموو فیوضـاتی عەشـقی خوای تیایە و والحاصـڵ ئەم نەوعە اعاظمە وەك (فارابی) و (ابن سـینا) و (شـێخ ئەبوسـەعید) فەلسـەفە و تەسـەووفیان لە شـەرقدا هێناوەتە مەیدان. کە عەوام لە کونهی ناگا و حەزرەتی مەولانا خالیدی خۆمان کە (مجدد)ی تەریقەتی نەقشبەندییە، ئەفەرموێ: هەر تەریقەیە تار و بۆکەی نەچێتەوە سـەر شەریعەت، ئیلحادە. بۆیە ئێمە کە خوا و هیمەتی مشایخان فرسەتی داین دیوانی مەولەوی و مەولانا خالیدمان کردووە بە کوردی ئەمانەوێ ڕوباعیاتی شـێخ سـەعیدی ئەبوالخیریش بکەین بە کوردی.

ڕوبـاعیـاتی خـەییـام زۆر کـەس بـە هـەموو زبـانێ تەرجەمەیان کردووە. تەنانەت شێخ ئەحمەدی شێخ سەلام لە پێشدا و شێخ سەلام لە پاشدا کردوویانە بە کوردی بەڵام ئەم ڕوباعیاتی شێخ ئەبوسەعیدە نەکراوە.)).

وەک لە نوسـراوەکەی پیرەمێرد دا دەردەکەوێت زۆر بە تاسە و تامەزرۆی شێعرەکانی ئەبووسەعید بووە، نیازی وا بووە کۆیان بکاتەوە و بیان کات بە کوردی و بە تەواوی سـرنجی پیرەمێردیان ڕاکێشـاوە، بەڵام وەک لە پێش دا ئیشـارەم پێ کرد: هەڵۆی مەرگ ئەم فرسـەتەی پێ

نەداوە، ئەگەر خودا یار بێ ئێستا من گەرەکمە خواستی پیرەمێرد بەدی بێنم.

پێویستە بڵێم هەر ئەو هەست وئیحساسەی لە کاتی خوێندنەوەی چوارینەکان بۆ پیرەمێرد پەیدا بووە بۆ منیش ڕووی دا، نزیکەی سێ چوار ڕۆژان دەم خوێندنەوە تا زیاترم دەخوێندنەوە زیاتر شێت و شەیدایان دەبووم، هەر بۆیە منیش ویستم بیانکەم بە کوردی بەڵام ئاخر چۆن؟ ئەگەرچی من لە سەرەتاوە عەلاقەیەکی تایبەتیم بە مێژووو ئەدەبیاتی کوردی وئیسلامی بە تایبەتی ئەدەبیاتی کوردی هەبووە، بەڵام قەت شێعرم نەنووسیوە وئەگەر تاک وتەراش شێعرێکم نووسی بێت شایانی ئەوەم نەزانیوە نیشانی کەسی بدەم.

دەست و قەڵەمێکی ئەوتۆشم نییە کە بتوانم ئەم کارە قورسە ئەنجام بدەم ئەوەندە نەبێت بە دەست و قاچی شکاو دەنووسم و بەس.

پەس خوایە چارە چیە. خۆ ئێستا شاعێری کلاسیک بە دەگمەن ماون، ئێستا زۆربەی شاعێرانی هاوچەرخی

کورد وەک: عەبدوڵا پەشێو وشێرکۆ بێکەس و... شێعری نوێ دەنووسن وەختە بڵێم شێعری کۆن فەرامۆش کراوە.

لەم چەند ڕۆژە دا هێندێک لە چوارینەکانم کرد بە کوردی و بە شـــــەوق و زەوقەوە بۆ هێندێک لە برادەرانم دەخوێندەوە، شـێعرەکانیان بۆ سـرنج ڕاکێش بوو، تەشـویقیان دەکردم درێژە بە کارەکەم بدەم، دیارە هێندێکیش گاڵتەیان پێ دەکردم. ڕاســـتی خۆشـــم زۆر باوەڕم بە خۆم نەدەکرد بتوانم هەتا سەر بڕۆم و ئەم ڕێگایە ببڕم.

چونکە تا زیاتر دەچوومە پێشـــەوە کارەکە قورســـتر دەبوو، بە ڕاسـتی شـێعرەکانی پیری خوراسـان یەکجار زۆر قووڵ و پڕ مەعنان، وە لە باری عیرفان و خواناســـی و فەلســـەفە و حیکمەت وەک دەریای بێ بن و ســـێڵاوی بەهاری وان، قووڵایی خودا پەرەســـتی و ئەخلاقیان لێ هەڵدەڕژێت. خۆ ئەگەر وشـــەیەک و پیتێک ئەم لاو ئەولا بێت مەعناکانیان دەگۆڕێت و بە پێچەوانەی مەبەســـت دا دەڕۆن، پێویستیان بەدیققەت و تێڕوانینی تایبەتی هەیە.

## دیسان خوایە چار چیە:

دەتوانم بڵێم لە ماوەی دە ڕۆژی یەکەم دا دە جار زیاتر لێیان سارد و نائومێد دەبووم و بێ هیوایی باڵی بە سەر دا دەکێشام و وازم لێ دەهێنان، بەڵام هەر ئەو سەعات پەشیمان دەبوومەوە و دووبارە دەگەڕامەوە سەریان، تا زیاتر نائومێدتر دەبووم زیاتر شێت و شەیدایان دەبووم. هەر بۆیە ماوەی سێ مانگ لە شەوەکانی پاییز و زستان شەو تا بەیانی نەخەوتم و کارم لە سەر کردن.

هێندێک لە شێعرەکانی ئەم زاتە پایە بەرزە ئەوەندە نزا و پاڕانەوەی بە سۆزیان تێدایە مچوڕک بە لەش دا دێنێت و خورپە لە دڵ دەدەن، وەک سیخوڕمە و نەشتەر دڵی مرۆڤ ئەنجن ئەنجن و کون کون دەکەن.

من خۆم کاتێک هێندێک لەو شێعرانەم وەردەگێڕا لە ناکاو فرمێسک بە چاوم دا دەهاتە خوارەوە، شەو نەبوو لە هەست و سۆزی ئەم شێعرانە دوو سێ جار نەگریم و ئاخ و حەسرەت بۆ تەمەنی بێهودە گوزەراوی خۆم هەڵ نەکێشم، هەستم دەکرد لە دنیاو لە دین دۆڕاوو بێ خێر ماوم.

بەڵام تا دەگریام هەستم دەکرد لەشم سووکتر و دەروونم ئاسوودەتر و فکرم زیاتر ئاوەڵا دەبێتەوە، کارەکەم ئاسانتربەرەو

پێشەوە دەڕۆیشت، ئێستا بە کردەوە و تەجرەبە بۆم مەعلووم بووە کە گریانی نیوەشەو کاتێک خەڵک لە خورپەی خەو دان لە خزمەت باری تەعالا تەواو تەنگ و چەڵەمەی دەروونی مرۆڤ چارە ســـەر دەکات، وە من ئەم ئەزموونەم لە سایەی چوارینەکانی پیری خوراسانەوە دەست کەوتووە.

ســـوپاس بۆ خودا بەرهەمی ماندوو بوونەکەم هاتە دی هیوادارم بۆ خەڵکی تریش بە سوود بێت ئەگەر چی کەم و کووڕی زۆر تێدایە.

❋❋❋❋❋

## (کورتە باسێک لەو ٦٥ چوارینەی پیرەمێرد)

پێویستە بڵێم چەند چوارینەیەک لەو٦٥چوارنیەی پیرە مێردی ڕەحمەتی وەری گێراون چەند دانەیەکیان ئەسەلەن شێعری ئەبووسەعید نین، بەڵام شێوەی شێعرەکانی ئەودەدەن.

هەر بۆیە ئیستا دوو لە چوارینەکانی پیرەمێرد بە کوردی و فارسیەکەی دەخەمە پێش چاوی خوێنەران. لە زمانی خۆی و فارسیەکەی خۆی.

**یەکەم:**

**با سر تو هر سوخته رازی دارد**
**با راز تو هر بنده نیازی دارد**
**ای رازق بخشنده تو نومید مکن**
**آنرا که به درگهت نیازی دارد**

سووتاوی لیقات هەر یەکە ڕازێکی هەیە
هەر بەندەیێ بەو ڕازە نیازێکی هەیە
بەخشەندە کە تۆ بی ناهومێدی ناکەی
چونکە بە هەوات سۆز وگودازێکی هەیە

**دووەم:**

**ای برآمدیت تو شاید همه ذات**
**تشکیک مشکّک نکند نعت صفات**
**ذات تو در آن دمیکه آید به صفت**
**هم ذات تو را ذات تو باشد مرآت**

تەنهاییپەکــەت بــە زاتـــت بـــاوەڕ دێنـــێ
شــوبهەی ئــەوی نەتناســێ ئەســەر نــانوێنێ
بــۆ ئەوکەســەوا لــە ڕووی ســیفاتت دەگــەڕێ
ئاوێنـــەیـــی زاتـــی خۆتـــە زات ئـــەنوێنێ

بە هەر حاڵ پیرەمێرد ناحەق نەبووە چونکە لە زەمانی ئەو دا شـێعرەکانی ئەبووسـەعید چاپ نەکرا بوون، وەک بۆخۆی دەڵێت لە ناو کتێب و بەیازە کۆنەکان چاوی پێکەوتوون و پێی وا بووە شـێعری ئەبووسـەعیدن، دەسـتی دەرد نەکا و خودا خێری بۆ بنوسێت.

بەڵام من خۆم لە کتێبی دائرةالمعارف ئیسـلامی ئەم چوارینەی خوارەوەم چاو پێکەوت کە تابلۆنووسێکی ئێرانی لە سەر تابلۆیەک ٤٠٠ساڵ پێش ئێستا بە خەتێکی جوان و ڕەنگین نووسیویەتی و پێم وایە شێعری ئەبوو سەعیدە و تام و چێژی شێعری ئەوی تێدایە و خستوومەتە نێو ئەم کتێبە، ئەویش ئەمەیە.

**زاهد نکند کـاری کـه قهـاری تـو　　ما محض گناهیم که غفـاری تـو**
**او قهــارت خوانــد و مــا غفــارت　　آیا بکدام نـا م خـوش داری تـو**

زاهیـــد هەڵەیـــە پێـــی وەیـــە قـــەهاری تـــۆ
مـــن پـــڕ لـــە هەڵـــەم پـــێم وەیـــە غـــەففاری تـــۆ
دەت ناســـێ بـــە قـــەهار و بـــە غـــەففاریش مـــن
کـــام بـــەندەیـــە لایـــق تـــرە بـــۆ کـــاری تـــۆ

❋❋❋❋❋

### کورتە باسێك لە ژیانی ئەبوسەعید (ابوالخیر)

باس و خواســی ئەم خواناســە پایە بەرزە لە ناو کتێبی مێژوویی و (تذکرەکان) یەک جار زۆرە و هەر یەکەی بە جۆرێکی دەگێڕێتـەوە. هێنـدێـک لـە پیرانی تـەریقـەت بۆ ئەوەی نیسبەتی (ابوسعید)بە تەریقەتی خۆیان بدەن یا خۆیان بە ئەو هەڵواسـن، زۆرترین قسـەو باسـیان لە سـەر نووسـیوە، ئێسـتا من لێرە دا ئەوەی زیاتر هەموویان لە سـەری کۆکن، بێ ئەوەی ئاماژە بە ســـەر چاوەکان بکەم و بڵێم فلان و فلان ئـاوا و ئـاوا دەڵێت، بـە کورتی دەخـەمـە پێش چاوی خوێنەری خۆشەویست.

## (ابوسعید ابوالخیر)

ناوی فضل الله (ابوسعید) کوڕی ئەحمەد (ابوالخیر) کوڕی موحەممەد کوڕی ئیبراهیم خەڵکی شاری میهنەیە.

لە سەرەتای ساڵی٣٥٧ی کۆچی لە شاری میهنە، کە ئەوکات بەشیک بووە لە خوراسانی گەورە لە دایک بووە.

وە لە ساڵی٤٤٠ی کۆچی لە تەمەنی٨٣ ساڵی کۆچی دووایی کردووە و هەر لە شارەکەی خۆی نێژراوە کە ئێستا شاری (میهنە) دەکەوێتە پارێزگای (عیشق ئاباد) پێتەختی حکوومەتی تورکمەنستانی ئێستا. هێندێکیش دەڵێن ٨٧ ساڵ ژیاوە.

(ابوالخیر)باوکی ئەبووسەعید کابرایەکی دەواو دەرمان فرۆش و (عطار)بووە. ژیانی بنەماڵەکەی لەم ڕێگەوە دابین کردووە، بەڵام پیاوەکی ئایینی و ئەهلی عیلم و دین بووە و زۆر سەروکاری لەگەڵ زانا و پیاوە ئایینەکانی سەر دەمی خۆی هەبووە و هامووشۆی ئەهلی تەریقەتی کردووە.

ئەبووسەعید شەوێک لەسەر داوای دایکی لەگەڵ باوکی دەچێتە کۆڕی زیکری ئەهلی تەریقەت.

ئەبووســـەعید ئەوکات تەمەنی ٥-٦ ســـاڵان بووە، لە کۆڕی زیکر دا یەکێک لە ســـۆفیەکان قەســـیدەیەکی عیرفانی دەخوێنێتەوە. ئەبووســـەعید گەرچی مناڵ بووە و عەقڵی بە مانای قەســـیدەکە نەگەیشـــتووە، بەڵام هەر بەم یەکجار گوێ ڕاگرتنە هەموو قەســـیدەکەی لەبەرکردووە، باوکی کە دەبینێ ئەم مناڵە ســـاوایە بیر و هۆشـــێکی تایبەتی تێدایە و زۆر زیرەک و خاوەن هۆشـــە، هەر لەو ساتەوە دەینێرێتە لای شێخ (ابومحمد عنازی) و دواتر لای شێخ(ابوسعیدعنازی )وخوێندنی قورئان وکتێبە سەرەتاییەکان لای ئەم دوو مامۆستایە بە ڕێک و پێکی تەواو دەکات.

دوای ٣-٤ ســـاڵ باوکی (ابوســـعید)دۆســـتایەتیەکی گەرمی لەگەڵ زانا و خواناســـی بە ناوبانگی ئەو زەمان شـــێخ (ابوالقاســـم بشـــر یاســـین) هەبووە و داوای لێدەکات کوڕەکەی بنێرێتە لای ئەو و دەرسی عیلمی و فیقهی پێ بڵێت و ئیرشـــادی بکات، هەر بۆیە ئەبووســـەعید تا تەمەنی١٧ســـاڵی لای ئەم زانایە ماوەتەوە و دەرســـی لە خزمەت خوێندووە و دڵ و دەروونیشی زاخاو کردووە.

بەڵام لە ناکاو (ابوالقاسم بشر یاسین) فەوتی کردووە. ئەبووسەعید یەکجار زۆر مامۆستا و ڕێبەرەکەی خۆی خۆش ویستووە، تا ماوەیەکی زۆر هەموو ڕۆژێ سەردانی گۆڕەکەی دەکرد و بۆی دەگریا.

دوای ماوەیەک ئەبووسەعید شاری میهنەی بە جێ هێشتووە و ڕووی لە ڕۆژاوای خوراسان کردووە و لە شارەکانی تری ئەم وڵاتە وەک شارەکانی مەڕو و سەرەخس و نەیشابوور تا تەمەنی٧٣ساڵی ماوەتەوە و درێژەی بە تەواو کردنی خوێندن و دەرس کوتنەوە و ئیرشاد و ڕێنمایی خەڵک داوە. بەڵام لە ساڵی ٥٣٠ لە نەیشابورەوە یەکسەر گەڕاوەتەوە شاری میهنە و دە ساڵی تریش لەوێ ژیاوە و کۆچی دوای کردووە و ئێستاش گۆڕەکەی مەزارگەی خەڵکی ئەو وڵاتەیە.

(ابوسعید ابوالخیر) تەنیا ٢٧ ساڵ لە شارەکەی خۆی میهنە ژیاوە واتە: ١٧ساڵی ئەووەڵ و١٠ساڵی کۆتایی ژیانی، باقی تەمەنی واتە: ٥٦ساڵ لە مەڕو و سەرەخس وە زۆرتر لە نەیشابوور ژیاوە.

(ابوسعید) کە خۆی موسڵمانێکی شافیعی مەزهەب بووە، ماوەی٥ساڵ دەرسی فیقهی شافیعی لای شێخ ابوعبدالله خضری شافیعی خوێندووە، بەڵام کاتێ ئەو مامۆستایەشی فەوت دەکات دەچێتە لای زانای بە ناوبانگ شێخ (ابوبکر قەففالی مروزی) دەرسی (صحیح بخاری) و (اصول فقه) و حەدیس و تەفسیری لای ئەم زانا ناودارە تەواو کردووە، دواتر هێندێک دەرسی عیلمی لای شێخ (ابوعلی زاهیر سرخسی) خوێندووە. ئێستا (ابوسعید) لە تەمەنی ٤٠ساڵی دایە و بە ناوبانگ و خاوەن نەزەرە، وە لە باری عیلم و زانستەوە کەس ناوێرێ قەرەی لە قەرەی بدات.

بەڵام (ابوسعید)بەوە لە خۆ ڕازی نەبووە، چونکە ڕووحی عیرفانی مامۆستای دەورانی جەوانی واتە: شێخ (ابو القاسم بشری یاسین) بە جۆرێک تەئسیری لە سەر ڕووحی عیرفانی (ابوسعید) دانابوو، ئارا و قاراوی لێ هەڵدەگرێت، ناچار بۆ زاخاوکردنی دڵ و دەروون و خوێندنی زیاتر ڕوو لە خانەقای شێخ ابوالفضل سەرەخسی دەکات.

شەوێک لە میانی کۆڕی زیکر دا (شێخ ابوالفضل) باسێکی عیرفانی و عیلمی لە سەر نێوی موبارەکی (الله) دەکات، (ابوسعید) لە میانی باسەکە دا لە هەیبەتان بێهۆش دەبێت و شۆر و غەوغای عەشقی خودایی شێت و شێدای دەکات و واز لە خوێندن و دەرس دێنێت و ئاوارەی چۆل و بیابان دەبێت و گۆیا ماوەیەکی زۆر بە گژ و گیا ژیاوە و هێندێک لە شێعرەکانی گۆیای ئەم حاڵەتەی ئەون، کاتێک کە دەڵێت:

لەو مەنزڵی خۆم شوێن و مەکانی پێدام
بۆ بەزمی ئەوین جێگەو بانی پێدام
دوا جار کە دڵی بردم و عەشقی کردم
بۆ دەشت بیابانێ نیشانی پێدام

**لە جێگایەکی تر دەڵێت:**

ڕۆژێک لە نەکاو دیم کە ئەوین پەیدا بوو
پێم وابوو دەگەم بە مەنزڵی لەیلا زوو
دوو مەنزڵ کە ڕۆیشتم و مەوجم بیینی
قاچم لە هەوا فڕاندمی دەریا زوو

(ابوسعید)لە کۆتایی سەدەی چوار و سەرەتای سەدەی پێنج، ڕوو لە شاری نەیشابوور دەکات، کەچی پێش چوونی خۆی ناوبانگی لە خوڕاســـان و نەیشـــابوور پێش خۆی کەوتبوو، هەر بۆیە خەڵک پێشـــوازی گەرمی لێدەکەن و ڕێز و حورمەتی تایبەتیان بۆ داناوە، وە تا ســـاڵی ٥٣٠ لە ئەوجی خۆشـــی ژیاندا ژیاوە و کۆتایی بە چەرمەســـەری ژیانی هاتووە و دەســـتی کردووە بە ڕێنمایی خەڵک و جەماوەرێکی زۆری لە دەوری کۆ بۆتەوە و بە تەبیعەتی حاڵ، نەیاری زۆریشی بۆ پەیدا بووە.

زۆربەی خەڵکی خوڕاســـان لەو ســـەردەمە دا حەنەفی مەزهەب بوونە، بەڵام ئەبووسەعیدخۆی کەشافیعی مەزهەب بووە. جارێک لە ئیمامو پێشـــنوێژی مزگەوت تووڕە دەبێت کە بۆچی لە کاتی تەحیاتی یەکەم و قنوت دا صـــەڵەوات بە تەواوی ناڵێت. پێویســـتە بڵێت: (اَللَّهُمَّ صـَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَ آلِ مُحَمَّد) بە ئیمامەکە دەڵێت: خەڵک نابێ ئەوەندە قڕنووس بێت و ســـڵەوات بە تەواوی بەڕێ نەکات و ئێمە لەگەڵ کاروانێک ناڕۆین ئالی موحەممەدی(د خ) تێدا نەبێت.

بە هۆی ڕەفتاری جوان و شایستەی (ابوسعید) سەدان کەس لە مەسیحی و یەهوودی و زەردەشتیەکان وازیان لە ئایینی خۆیان هێناوە و موسوڵمان بوونە.

(ابوسعید) ساڵی ٤٣٠دەگەڕێتەوە میهنە، دە ساڵ لەوێ ژیاوە و لە ٤٤٠ی ک، کۆچی دوایی کردووە و کوڕ و کچ و نەوە گەلێکی زۆری لە دوای خۆی جێ هێشتوە و حەتتا ژنانی بنەماڵەکەشی لە ڕێی تەریقەتەوە ڕێنمایی و ئیرشادی خەڵکیان کردووە.

١٠٩ساڵ دوای فەوتی (ابوسعید) واتە: لە ساڵی٥٤٩ی ک، هێرشی تورکانی (غوز) کە لە درندەگی دا ڕووی مەغوولەکانیان لە مێژو دا سپی کردۆتەوە، ڕووی داوە و زیاتر لە١٠٠کەس لە بنەماڵەی (ابوسعید) و هەزاران کەس لە خەڵکی شاری میهنە کوژران و خەڵک بەرەو ڕۆژ ئاوای ئێران ئاوارە بوونە و هێندێک لە بنەماڵەی (ابوسعید)یش وێڕای خەڵك ڕوویان لە ڕۆژئاوای ئێران و کوردستان و بەغدا کردووە و هێندێکیان لە شاری قەزوین گیرساونەتەوە و هندێکیشیان هەتا بەغدا ڕانەوەستاون و

لەوێ گیرســـــاونەتەوە، کە شـــــێخ (ابوالبرکات محمد بن عبدالمنعم) ٥٩٦ی کۆچی، شـێخی ڕەباتی بەسـتامی، وە شێخ ابوالفضل احمد بن عبدالمنعم شێخی ڕەباتی خەلیفەی عەبباســـی، لە ســـاڵی٦١٤ی کۆچی، کۆچیان کردووە و هەردووکیان لە تۆرەمەی (ابوسعید ابوالخیرن).

ئەمە بوو کورتەیەک لە ژیانی پیری خوراســـــان و بنەماڵەکەی. بەڵام بۆ زیاتر ئاشـنا بوون بە خسـووسـیاتی (ابوسعید) کتێبی (اسرارالتوحید) کە بە دەستی یەکێک لە نەوەکانی (ابوسعید) بە ناوی (محمد بن منور) لە ساڵی ٥٧٠ نووسراوەتەوە، باشترین سەرچاوەیە و بە تێر و تەسەلی باسی ژیانی (ابوسعید)ی نووسیوەتەوە.

دەکرێ بگوترێت زۆرترین ناو بانگی (ابوســـعید) لەم چوارینەی خوارەوە دایە کە دەڵێت:

حۆریـان کـە بـۆ سـەیری یـاری مـن سـەفیان بەسـت
دەی خســتە ســەری لــە هەیبــەتان (رضـوان) دەســت
دای خـــاڵی ڕەشـــی بـــە ســـەر ڕوخـــان دا پـــەردە
عــەوداڵ لــە تــرس، بــۆ (مصـحفان) بردیـان دەسـت

## فارسیەکەی:

| | |
|---|---|
| حـــورا بـــه نظـــاره نگـــارم صـــف زد | رضوان زتعجـب کـف خودبرکـف زد |
| یک خال سیه بـرآن رخـان مطـرف زد | ابدال زبـیم چنـگ درمصـحف زد |

بە درێژایی ١٠٠٠ســاڵی ڕابردوو ئەم چوارینە هەمیشــە جێگای مشت و مڕی خانەقانشین و پیاوانی تەریقەت بووە، وە من لێرە دا ناوی چەند کەس و کتێبێک کە شــــەرح و شـرۆڤەیان لە سـەر ئەم چوارینە نووسـیوەتەوە لە زمانی خوا لێخۆشـبوو (سـعید نفیسـی)کە لە شـەرحە فارسـیەکەی ئیشاڕەی پێکردووە بەکورتی دەخەمە پێش چاوی خوێنەران.

١ــــ شەرحی شێخ ناصرالدین عبیداله بن محمود شهاب الدین احرار شاشی کە بە شێخی ئەحرار ناوبانگی هەیە و یەکێک بووە لە مەشـــــایخی تەریقەتی نەقشــــبەندی و لە ٨٠٦ لـە دایـک بووە و لـە ٨٩٥ی ک، کۆچی دوایی کردووە، ناوی کتێبەکەشی ناوە (رسالە حورائیە).

٢ـ شێخ محمد مغربی کـە لـە سـەدەی٩ ژیـاوە و ئـەویش پـەیڕەوی تـەریقـەتی نەقشـبەندی بـووە، شـەرح و شـرۆڤەی ئـەم چوارینـەی کـردوە و نـاوی نـاوە (رسـالە حورائیـە) و سەرەتاکەی ئاوا دەست پێ دەکات:

بسم الله الرّحمن الرّحيم بعد الصلواة.... اما بعد قال الشيخ العارف المحقق المدقق صاحب البسط و الشهود و الجمع و الوجود متمم دايرة الصــلوة بالقيام عبداله الباســط المســافر الباطن شمس الحقيقة و الطريقة و الشريعة ابو سعيد بن ابى الخير قدّس ســرّه. قال الشــيخ العالم العارف ... محمد بن المغربى قدس سره اما بعد... الخ.

**٣. شا نعمة الله** وەلی کرمانی (٧٣١-٨٣٤) کە بە ڕێبەری تەریقەتی نیعمەتیە ناسراوە. **شا نعمة الله** شەرح و شرۆڤەی چوارینەکانی (ابوسعید) کردووە بەڵام بۆ چوارینەی (حورا) بە تەنیا رسالەیەکی نووسیوە و ناوی ناوە (رسالە حورائیە).

٤. رسالەیەکی تریش هەیە کە ئەویش هەر بە (رسالە حورائیە) ناو نراوە بەڵام نوســەرەکەی مەعلووم نییە و ســەرەتاکەی ئاوا دەست پێ دەکات:

.....قســەی ئیمە گەیشــتە ئەوەی کە دەروێشــێکی خۆشــەویســت پاڕاوە و داوای مەعنای چوارینەی شــیخ الإسلام قدوة الأنام الشيخ العالم قطب المشرقين و تاج العارفين

صــفوة العالمین شــیخ ابوســعید ابوالخیر قدّس الله روحه العزیز، كه دەفەرمویێت: حۆریان كه بۆ سەیری یاری من سەفیان...الخ.

جگه لەو چوار رسـاله دوو ڕسـالەی تریش هەن كه نووسەرەكانیان مەعلووم نییه. بەڵام له نێو زۆربەی تەزكەرە فارسـیەكان دا شـەرح و شـڕۆڤەیان بۆ چوارینەكانی تری (ابوسعید) نووسیوە.

(ابوسعید ابوالخیر و ابن سینا و عمر خیام)

ئەم سـێ زانا به ناوبانگه گەرچی هاوچەرخ بوون بەڵام وا وێ ناچێ له نێزیكەوە یەكتریان ناسیبێت.

گۆیا ابن سـینا له نامەیەک دا ئەم چووارینەی خووارەوە بۆ ئەبووسەعید دەنووسێت و دەڵێت:

بینی وبینک فـی المودةنسـبة مســتورةعن‌عین هذاالعالم
نحن اللـذان تعارفـتاروا‌حنـا من قبل خلق الله طینة آدم

(ابوسعید ابوالخیریش)بەم‌چووارینە جوابی دەداتەوە كه دەڵێت:

جانـا مـن و تـو نمونـه پرگـاریم سرگرچه‌دوکرده‌ایم یـک‌تـن‌داریـم
بر نقطه روانیم کنـون چـون پرگـار در آخر کـار سر بهـم مـی آریـم

گیانــه مــن و تــۆ هــەر دوو ســەری خــەتتێکین
لــک گــەرچی دووە بــەڵام لــە پەیوەنــدێکین
ئێســتا كــە لــە ســەر هێــڵ و مــەداری جغــزین
دوایــی هەســت ئەکــەی لــە مــاکی پەیوەنــدێکین

هەر وەها دەڵێن عومەری خەییام ئەم چوارینەی خوارەوە بۆ (ابوسعید) دەنوسێت کە دەڵێت:

دارنــده چو ترکیب طبایع آراست
از بهر چه افکندش اندر کم و کاست
گر نیک آمــد شکستن از بهرچه بود
ور نیک نیامداین صور عیب کراست

**مامۆستا هەژاری ڕەحمەتی ئاوای کردووە بە کوردی:**

ئـــەم خەڵکـــە لـــە کارگـــای خـــودا دێنـــە دەرێ
هـــەر کـــاری ئەویشـــە سـیس دەبـــێ و هەڵـــدەوەرێ
ئـەی خوایـە ئەگـەر بـاش بـوولـەپـای چـی نەتهێشـت
گـــەر پـــووچ و چرووکـــە کێیـــە کردوویـــە بـــەرێ

**گویا ئەبووسەعیدیش ئاوای جوواب داوەتەوە:**

خـــەییام بـــەدەنت ســـنەوبەری ڕوو بـــە هـــەوا
فەرمانـــدە ڕوحـــە و مـــەنزڵی ئـــەو داری بـــەقا
داری لەشـــی تـــۆ دەڕزی کـــە مۆرکـــەی لێـــدا
دەیخاتـــە ئـــەرز کـــاتێ کـــە ڕووحـــت دەڕوا

**فارسیەکەی ئەمەیە:**

خــیام تنت به خــیمه ای مــانـد راست
جان سلطانی که منزلش دار بقاست
فــراش اجل ز بهر دیــگر مـــنزل
نه خیمه بیفکند چون سلطان برخاست

بەڵام وێناچێت (ابوسعید) و خەییام هاو تەمەن بووبن.

چونکە (ابوســـعید)لەســـاڵی ٤٤٠ یا ٤٤٧ک، کۆچی دووایی کردووەو و خەییام لە٥٢٠ک، کۆچی دوایی کردووە، وە ئەگەر خەییام تەمەنی بە قەد تەمەنی (ابوسـعید)بوویێت، واتە ٨٣ ســـاڵ ژیا بووبێت ئەو کاتە خەییام تەمەنی ٦و ٧ ساڵان بووە.

بەڵام شێعرەکە، شێعری (ابو سعید)ە،لەوانەیە بە کابرایەکی خەییامی واتە چادر درووی کوتبێت. یا هەر بە باوکی عومەری خەییامی گوتوە،چونکەباوکی خەییامو (ابوسـعید) هەر دوو لە نەیشـــابوور ژیاون. وە عومەری خەییامیش ئەم نازناوەی خەییامی لە باوکییەوە پێگەیشـــتووە و باوکی عومەری خەییام چادر دروو بووە و ئێســـتاش لە نێو عەرەبەکان هەر بە(خیّامی) ناو دەبەن نەک بە خەییام.

خاڵی هاوبەش لە نێوان (ابوسـعید) و خەییام ئەوەیە کە هەردووکیان خاوەن یەک زەوق و قەریحەی شـێعری بە دوو ئاراستەی جیاوازن و هەر دووکیان باشترین چووارینەسەرای ئێرانین کە تا ئێستا هیچ یەک لە شاعیرانی ئێرانی نەیان توانیوە چووارینەی ئاوا بە تام و بڵند و پڕ مانا بهۆننەوە.

بەڵام لە باری دەروونییەوە تەواو لێک جیاوازن چونکە خەییام پیاوەکی خۆش گوزەران و سەر بە بنەماڵەی حاکمانی سەلجووقی بووە و زۆر جار لەسەر مووچەی ساڵانەی لەگەڵ حاکمانی سەلجووقی دەمە قاڵەی بووە و لە باری زانستیش خەییام زانایەکی بێ وێنەی فەلەک ناسی و نجوومی بووە و لە باری ڕوانگەی مەزهەبیشەوە زانایەکی موعتەزیلی و عەقڵ گەڕا بووە.

بەڵام(ابوسعید) بە پێچەوانەی ئەو، زانایەکی تەسلیمی خواخواز و خۆ نەخواز بووە، دڵ وگیان ودنیای خۆی بەخودا فرۆشتوە وشەقی لەدنیا داوە وبنەمای ژیانی دوای مەرگی لەبەر چاو گرتووە. بەڵام زاهید مەسەلەکیش نەبووە، چونکە کاتێک دێتە نەیشابوور زۆر کۆک و پۆشتە ژیاوە، بەو حاڵەشەوە لە تەواوی ژیانی دا دەستی لە ڕاست حاکمان و غەیری خودا پان نەکردۆتەوە و زۆر بێ منەت ژیاوە.

لە کۆتاییدا دەبێ ئەوەش بڵێم کە هەم(ابوسعید)و هەم خەییامخاوەنی بەهێزترین قسە وڕاو بۆچوونن بە دووئاڕاستەی جیاواز دا کە هەتا هەتایە ناویان لە ئاسمانی عیلم و ئەدەبیاتی ئێرانی دا ڕۆژ بە ڕۆژ درەوشاوەتر دەبێت.

*****

## دووایین قسە

خوێنەری خۆشەویست ئەوەی لەبەر دەستت دایە نێزیکەی ٧٢٠ چوارینەی پیری خوراسانە کە بەم قەڵەمە شکاوەی خۆم بە کوردی وەرم گێڕاون، ئەگەر خوای گەورە قەبووڵی بکات، من خۆم زۆر لە کارەکەم ڕازی نیم بەڵام هەر ئەوەندەم لە دەســـت هاتووە. هیوادارم ئێوەش بە ڕووح بەرزی خۆتان قەبووڵی بکەن، وە ئەگەر کەم و کورتیشی هەبێت و بە یەقین هەیەتی: هەڵەکانم بۆ ڕاســـت بکەنەوە و چاو پۆشی لە عەیبەکانم بکەن.

ئومێدەوارم ئامانجەکانی خۆم پێکا بێت کە بریتین لە:

١ـ هێنانە دی ئاواتی مامۆستای ڕۆژنامەگەری و شێعر و ئەدەبیاتی کوردی پیرەمێردی نەمری ڕەحمەتی.

٢. خزمەت بەزمان وئەدەبیاتی کوردی وگوازتنەوەی ئەدەبیاتی فارســـی بۆ نێو ئەدەبیاتی کوردی، چونکو بە ڕاســـتی ئەدەبیاتی زمانی فارسی زۆر دەوڵەمەند و بەهرە دارە.

٣. خزمـەت بە ئەخلاق و فەلسەفەی ئەخلاقی و دینی و کۆمەڵایەتی کوردی.

٤ـ مستێک بێ لە دەمی ئەوکەسانەی دەیان هەوێت هەژار گوتەنی: بە تۆپە قورِ رِۆژ دا پۆشـــن. زورِنا لە ســـەری گوشـــادیەوە لێ دەدەن و دەڵێن: زمانی کوردی ســـێ چوار هەزار ووشــــە زیاتر نییە و تەنیا زمانی ئاخاوتنی تورکە کێویەکانە، وە من بە رِاشـــکاوی دەڵێم کە زمانی کوردی زۆر خۆشتر و رِەوان تر، هەست و سۆزی زمانی ئەدەبیاتی عیرفانی پێ شرۆڤە دەکرێت.

٥ـ هـــەر وەک دەزانـــین شێـــعر لە سەر وەزنی **(لاحول ولا قُوَّة إلا بِالله)** کـە وەزنی تـایبـەتی چوارینـەیـە لـە نێو شــــێعری کوردی دا زۆر کەمە وە جگە لە چوارینەکانی خەییام کە مامۆســــتا هەژار کردوویە بە کوردی، دیوانی ترم نەدیوە. وە ئەم شێعرانەی پیری خوراسانیش هەموویان لە ســــەر کێشــــی تـایبـەتی چوارینـەن، بـە هیوای ئـەوەی کتێبخانەی کوردی پێ دەوڵەمەند بکرێت و لە مەو دوا شێعری زیاتر لە سەر ئەم وەزنە بهۆنرێتەوە.

هـەوڵم داوە لـە وەرگێرِانی چوارینـەکـان لـە مـەعنـا و ناوەرۆکی شــێعرە فارســیەکان لانەدەم و ئەگەر لە هێندێ

شـــــوێن دا مەعنای نامۆیان لێ وەردەگیرێت گوناهی من نییە و عەینی دەقە فارسیەکەم وەرگێڕاوە.

بەڵام لەبەر ئەوەی چوارینەکان عیرفانین تۆزیک لە باری مەعنایی قورس و گرانن و پێویســـتیان بە شــــەرح و شـرۆڤە هەیە، وە ئەسـلی کتێبە فارسـیە کەش شـەرحی بۆ هێندێک لە شـێعرە قورسـەکان نووسـیوەتەوە، منیش ئەگەر خوا یار بێت و خەرجی چاپ ئیجازەم پێ بدا شـــــرۆڤەیان دەکەم.

پێویستە ئەوەش بڵێم کە بە درێژایی ١٠٠٠ساڵی ڕابردوو خەڵک هێندێک لەو شێعرانەی کە نزا و پاڕانەوەیان تێدایە لـەبـەریـان کردووە و لـە کـاتی نـەهـامـەتی و تـەنـگ و چەڵەمەی ڕۆژگار و خۆ پاراستن لە زوڵمی زاڵم و ستمکار و ترس و دڵەڕاوکێ و نەخۆشی و سەرئێشی و ددان ئێشان و چی و چی... لەبەر خۆوە خوێندویانەتەوە.

هێندێک لە شـێعرەکان لە مەتنە فارسـیەکە دا ئادابی تایبەتیان بۆ نووسراوەتەوە، مەسەلەن: ئەگەر شەو دەس نوێژ بگری و دوو ڕکەعەت نوێژ بخوێنی و ســـــەڵەوات لێبدەیت

وپاشـان لە کاتی دووعا دەسـت لە بەر خودا پان بکەیتەوە و ئەم شـێعرە بخوێنێتەوە و بە چاوی فرمێسـکەوە چەند جار و چەند جاری کەیتەوە خوای گەورە دوعات قەبووڵ دەکات و کارەکەت ڕاست دێت.

وە لە ئەسلی فارسیەکە دا چەن لاپەڕە بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کراوە و بۆ هەر چوارینەیەک دەســـتووری تایبەتی بۆ نووســــــراوەتەوە. هیوادارم بتوانم ئەم هەر دووکارە ئەنجام بدەم ئەگەر خودا یار بێت.

لە کۆتاییدا سپاسی هەڵەگیری و پێداچوونەوەی برای بەڕێزم کاک (شاڕوخ حسن زادە) دەکەم.

شنۆ١٨ی جۆزەردانی ١٣٩٦ی هەتاوی

ئەسعەد شەڕافەت

*****

# پیتی (ا)

١

ئـەی عابیـد لـە بـەر داغـی تـۆ پـڕ ناڵـە وو ئـا
غـەیـری تـۆ جیهـان کێـی هـەیـە تـا نـاوی ببـا
کـەس نیـە کـە لـە دەسـتی غـەمی تـۆ گیـانی بـا
یـەکێکی لـە ناکـاو دەکـوژی یـەک بـە نیگـا

٢

خۆزیـــا کـــە منیـــان لـــە نـــاو نـــەفت وەردابـــا
نـــەم بەخشـــن و ئـــاگر لـــە لەشـــم بـــەربووبا
خـــێ یـــان لـــە هـــەموو کـــاتێ لـــە چـــاوم کردبـــا
دابـــڕان و جـــودا بوونـــەوە قـــەت نـــەم دیبـــا

٣

دڵ کـــاتی ســـەما بـــۆنی لـــە دڵـــداری دەبـــا
ئێمـــە بـــۆ ســـەراپەردەی ئەســـڕاڕی دەبـــا
ئـــەم زەمزەمەیـــە ئەســـپی مـــرادی تۆیـــە
بـــەم ئەســـپەیە دڵ بـــە خزمـــەتی یـــاری دەگـــا

٤

تـــا شـــەمعی دڵـــم بـــۆ غـــەمی دووری ســـووتا
گیـــان و دڵ و دیـــدەم لـــە ســـەبووری ســـووتا
ئـــەم شـــەمعە چ دڵ پاکـــە لـــە تـــاوی دەردم
نەکوژایـــەوە تـــا جـــەرگی لـــە نـــووری ســـووتا

٥

ئـــەو ڕۆژە کـــە دیـــم چـــاوی لـــە چـــاوم لا دا
ئـــاوری لـــە دەروون و لـــە هـــەناوم بـــەر دا
وا ئێســـتە ســـەدان جـــارە لـــە عـــەشـــقی ئـــەو دا
نـــەک زینـــدوو دەڵـــێن: مـــردوو لـــە تـــاوم گریـــا

٦

قـــازانجێ دەکـــەم خـــۆ لـــە ســـەفم دا ئەعـــدا
کـــەی مســـتێ لـــە خـــاک فرســـەتی پێـــدا دەریـــا
شمشـــێری قـــەزا تیـــژە لـــە دوو لا دەبـــڕێ
بێگانـــە ئەگـــەر خـــۆ لـــە دڵـــم دا فـــەوتـــا

٧

بـــوون، گـــەر نـــەبێ ئامـــادە لـــە نێـــو کـــارێ دا
پڕکـــارە، نـــە بێکـــارە لـــە هـــەر ئـــانێ دا
(کُـــلُّ یَـــومٍ هُـــوَ فِـــی شَـــأن) نوکتێکـــە
پێویســـتە بزانـــی لـــە هـــەموو حـــاڵێ دا

٨

ئەوکـــەس لـــە ســـتەم خێمـــە وو بـــانی هەڵـــدا
چـــۆن خـــۆی لـــە دوعـــا و ئـــاهی بـــەیانی لادا
ئـــەی ڕێگـــر و مێگـــر بەســـە هۆشـــێکت بـــێ
گـــەردوون وەکـــوو تـــۆی زۆری بـــە لاوی بـــادا

٩

گـــەر بمـــرم و ســـیی ســـاڵ بـــێ بـــە ســـەر مەرگمـــدا
دەیبیینـــی ئـــەوین مـــاوە لـــە نێـــو گۆڕمـــدا
گـــەر دەســـتێ بـــە خـــاکی گۆڕەکـــەم داکێشـــی
دێ دەنگـــێ دەڵـــێ خۆزگـــە کـــە مەعشـــووقم بـــا

١٠

ســـیخوڕمە بـــە دەس یـــارم و لـــە دڵـــی منـــدا
ڕۆژانـــە لـــە جـــەرگی مـــن و لـــە دڵـــی منـــدا
ترســـم لەوەیـــە چونکـــە لـــە دڵ جێـــی تەنگـــە
لێـــی تێکچـــێ لـــە خـــۆی داتـــەوە لـــە دڵـــی منـــدا

١١

دوێ شـــەو کـــە ڕوخـــی هـــات و نیشـــانی منـــدا
نەیهێشـــت کـــە دڵـــم لـــە شـــوێنی تـــر ڕۆشـــن بـــا
ئەوکاتـــە کـــە ڕووی نوانـــد دڵـــی مـــن ڕۆیـــی
چـــارم بـــۆ نـــەما هـــەر دەبـــوو ئـــەو بـــۆ مـــن بـــا

١٢

هـــەر چەنـــدی گوناهـــت هەیـــە لای بـــاری خـــودا
غـــەم دانـــەگری لـــە گەردشـــی چـــەرخی بـــەڵا
گـــەر مانـــدوو لـــە زۆر بـــوونی گونـــاهی ئـــەمڕۆ
بـــێ غەمبـــە کـــە ناخودایـــە لـــەم چەرخـــە خـــودا

١٣

ئـــەم ڕشـــتە کـــە تاقـــەتی ڕەوانـــم لـــەو دا
ئـــارامی دڵ و ڕاحـــەتی گیـــانم لـــەو دا
گیـــانم کـــە بکێشـــی بـــۆ ســـەری لێـــوانم
پەیوەســـتە لەگـــەڵ ڕووح و ڕەوانـــم لـــەو دا

## ١٤

یارم لە دڵم دایە لە دڵ، پێوە دە دا
هە ر چە ند کە دە ڵێم پێوە دە دڵ، پێوە دە دا
خۆی خاوە نی شەشدانگی مە قامە لە دڵم
ترسم لەوە، خوین بێتەوە دڵ، پێوە نە دا

## ١٥

بەختم سەری بێ بەختی لە خۆشی تێدا
دڵ مەیلی لە زیکر و شڕە پۆشی تێدا
کاتێک بە سوئالێکی بەهەشتم پێدەن
سەروەت ئەوەیە سەری خەمۆشی تێدا

## ١٦

دوو دیدە لە جێی خەو ئەوە ئاوی تێدا
بۆ دیتنی تۆ خوێنی هەناوی تێدا
ئێژن بخەوە بەڵکە لە خەو بیبینی
ئەی بێخەبەران یادی حەیاتی تێدا

١٧

پـــەرتووکی ئـــەوین کەســـێکی نێـــوی تێـــدا

فرمێســـــک و کڵـــو و دیمـــەنی زەردی تێـــدا

بـــۆ دەوری ســـەری تۆیـــە کـــە شـــۆری تێـــدا

قوربـــانی دڵـــی پـــڕ غەمـــە دەردی تێـــدا

١٨

ئێـــژن کـــە قیامـــەت شـــەڕە چەقەقـــەی تێـــدا

خـــوا تـــوورە لـــە ئـــەم خەڵکەیـــە گـــرژی تێـــدا

خـــوا خێـــرە لـــە خێـــریش جگـــە خێـــر ڕوو نـــادا

دڵ تـــەنگی مەبـــە ئـــاخیری خێـــری تێـــدا

١٩

عاشـــق هـــەموو دەم لـــە فکـــری دڵـــداری دا

دڵـــدار لـــە کروشـــمەو لـــە ســـەری نـــازی دا

ئێمـــەین کـــە گونـــاە دەکـــەین و ئـــەو لوتـــف و کـــەڕەم

هەرکـــەس بـــۆ شـــتێک قابیلـــە ئـــەنجامی دا

٢٠

بەنـــــدێکی گوناکـــــارم بـــــزەت لـــــە کوێـــــدا
دۆڕاوە دڵـــــم بەخشـــــینەکەت لـــــە کوێـــــدا
بـــــۆ کردەوەکـــــانم گـــــەر بەهەشـــــتم پێـــــدەی
ســـەودایەکی یەکســـان، کـــەڕەمت لـــە کوێـــدا

٢١

تـــــاوان و گونـــــاهن هەیـــــە ســـــەحرا ســـــەحرا
لای ڕەحمـــەتی تـــۆ ســـووکە وەکـــوو تـــۆز و بـــا
هـــەر چەنـــدی گونـــاهی مەیـــە کەشـــتی کەشـــتی
غـــەم مـــان نییـــە تـــۆ ڕەحمـــەتی دەریـــا دەریـــا

٢٢

لـــەو پێشـــتر کـــە تـــاقی چـــەرخی ئـــەعلا بەســـرا
ئـــــەم بارەگـــــە وو کـــــەوانی مینـــــا بەســـــرا
دڵ لـــــە عـــــەدەم ئابـــــادی ئـــــەزەل ڕازابـــــوو
عـــەشـــقی تـــۆ بـــەبێ مـــن بـــە قـــەدم دا بەســـرا

٢٣

لـــــەو ڕۆژەوە ڕوونـــــاکی ســــــوڕەییا بەســــــرا
ئــەم ناوچـــە بـــە یـــەکجاری لـــە جـــەوزا بەســـرا
وەک ئـــاگری ســـەر شـــەم لـــە نـــەبوون ئـــاوادا
عـــەشـــقی تـــۆ بـــە بـــەژن بـــە قـــەدم دا بەســـرا

٢٤

ئـــــەو ڕۆژە بڵنـــــدایی لـــــە کێـــــوان بەســـــرا
هـــەم بـــەژنی بڵنـــدیش لـــە چنـــاران بەســـرا
پـــا بەســـتە لـــە زنجیـــری ئـــەوینت مـــن بـــووم
شـــەیداییم لـــە جـــەرگ و لـــە دەمـــاران بەســـرا

٢٥

یـــا ڕەب بـــە موحەممـــەد و عـــەلیی و زەهـــرا
یـــا ڕەب بـــە حوســـەین و حەســـەن و ئـــالی عـــەبا
بـــەو ڕەحمـــەتی خـــۆت بهێنـــە دی حاجـــاتم
بـــێ مننـــەتی عالـــەم ئـــەی بڵنـــدی ئـــەعلا

٢٦

بـــەو بـــەژنی تـــەڕی نـــازی لـــە چـــاوان دەڕژا
لـــەو تـــەختی ڕوخـــی گـــوڵ بـــوو لـــە دامـــان دەڕژا
بـــۆ مـــاچی بـــەری پێـــی تـــۆ گـــوڵی نـــەو ڕەســـتە
حەســـــــڕەت لــــــە دڵ و نـــــاخی هـــــــەناوان دەڕژا

٢٧

لـــەو کـــوفری ســـەری پەرچـــەمی ئیمـــان دەڕژا
لـــەو لێـــوی تـــەڕی چەشـــمەیـــی حـــەیوان دەڕژا
وەک کـــۆتری خـــەرامان کـــە بـــە ســـەد ڕەعنـــایی
ڕۆیشـــــت و لـــــە خـــــاکی قـــــەدەمی گیـــــان دەڕژا

٢٨

شـــیرینە دەمێـــک، لـــە لێـــوی ئـــەو گیـــان دەڕژا
کـــوفری لـــە ســـەری زولفـــی پەرێشـــان دەڕژا
گـــەر شـــێخێ لـــە کـــوفری زولفـــی ئـــەو حـــاڵی بـــا
خـــاکی قـــەدەمی ئـــەوی لـــە ئیمـــان دەڕژا

## ٢٩

ڕۆیشـــــتم و خـــــوێنی دڵ لـــــە ڕێیـــــان دەڕژا
ئــــاگر لــــە هــــەناوم بــــە بڵێســــان دەڕژا
تــــا هــــاتم و شــــەوقت لــــە جیهــــانم بینــــی
داوێنــــــی گـــــــولآنم لــــــە گوناهــــــان دەڕژا

## ٣٠

دێوانـــــەیی تــــۆ دووری لـــــە ســــەحڕا ناکـــــا
شــــەیدایی غــــەمت فــــەڕقی ســــەر و پــــا ناکــــا
هەرکــــەس کــــە بــــە تــــۆ دەگــــا لــــە خــــۆ دادەبــــڕێ
ئــــەو کــــەس کــــە ئــــەتۆی ناســــی تەماشــــا ناکــــا

## ٣١

کــــوێرە ئــــەو چــــاوە کــــە ســــەیری خڵقــــەت ناکــــا
لاڵــــە ئــــەو زارە کــــە گفتوگــــۆی حــــەق ناکــــا
ئــــەو جــــەرگ و دڵــــەی بــــۆنی وەفــــا لــــەو دوورە
گــــەر بــــۆ ســــەگی دانێــــی دەمــــی قــــەت لــــەو نــــادا

## ٣٢

گیانێـک کـە لـە دەرگـاهی تـۆ جۆیـەک ناکـا
کـاروانێ لـە دەرگـاهی تـۆ جۆیـەک ناکـا
بـۆ ژوانـی تـۆ جیهانێـک بـە نرخـی جۆیـەک
جینسـی مـە، هـەموو نیـوە لـە جۆیـەک ناکـا

## ٣٣

لـەو دەسـتی غـەمی تـۆ دڵـە، شـادی ناکـا
لای تـۆ غـەم و ناڵـەی منـە، سـودێ ناکـا
نـاڵینم لـە دەردێکـە چ کـەس نـازانێ
گـڕ گرتمـی ئـەم ئـاگرە دودێ ناکـا

## ٣٤

ئـەی ناڵـە ئەگـەر دەمێکـە قەیـدی ناکـا
ئـەم غافـڵ و مەسـتە ئەسـەری لـێ ناکـا
دڵ عاشـقی لەیلایـە عـەجایب مـاوم
بـەم مـوویی سـپی سـەیرە کـە شـەرمێ ناکـا

## ٣٥

گاورێـــک لـــە ســـەرم دا هەیـــە شـــەرمێ ناکـــا
دەی وێ کـــە ســـەرم ببـــڕێ لـــە نـــاخی ڕاکـــا
ئیمـــانی ســـەدان جـــارە بـــە گـــوێ هـــەڵـــدێنم
شـــەرمێ نـــە لـــە مـــن، شـــەرمێ لـــە خۆشـــی ناکـــا

## ٣٦

عاشـــق کـــە ڕیـــا نـــەکا لـــە بـــەر تـــۆ چ بکـــا
شـــەوگاری بـــە غـــەم ڕانـــەبوێرێ چ بکـــا
گـــەر پەرچـــەمی تـــۆ شـــانە نـــەکا ئـــەی چ بکـــا
شـــێتی تـــۆ کـــە زنجیـــری نـــەجاوێ چ بکـــا

## ٣٧

دڵ تـــەنیا ئـــەوینی تـــۆ نـــەپێکێ چ بکـــا
گیـــان دەوڵـــەتی وەســـڵی تـــۆ نـــە خـــوازێ چ بکـــا
ئەوکاتـــە کـــە ڕۆژ شـــەوقی لـــە ئاوێنـــەی دا
ئاوێنـــە (انـــا الشـــمس) نـــەبێژێ چ بکـــا

## ٣٨

گـــەنجی مـــن لـــە نـــاو قاســـەیی گەنجینـــە شـــکا
ڕازم هـــەموو لـــەم ســـینەیـــی بـــێ کینـــە شـــکا
هـــەر شـــوعلەیـــی ئـــارەزوو کـــە لـــە گیـــان هەســـتا
وەک شوشـــەیی ئاوێنـــە لـــە نێـــو ســـینە شـــکا

## ٣٩

جـــوان تـــر لـــە ئـــەوەی کەسـێک خـــەیاڵی تـــۆ کـــا
یـــا وێنـــە منێـــک فکـــری ژوانـــی تـــۆ کـــا
شـــایەد کـــە بـــە ئـــافرانی بکـــا شـــانازی
یـــەزدان کـــە تەماشـــایی جـــەماڵی تـــۆ کـــا

## ٤٠

چـــەنگاڵی پڵنـــگ ئەگـــەرچی لـــەش پـــارە دەکـــا
ناگـــا بـــە دوعـــای هـــەژاری دڵ پـــارە دەکـــا
ئـــاهی دڵـــی بێنـــەوا وەکـــوو شمشـــیرە
گـــەر خـــۆی نـــەبڕێت، بـــڕاوەکـــەی پـــارە دەکـــا

## ٤١

نەققاشـــیێ ئەگـــەر، لـــە مـــوویێ پـــەڕگاریێ کـــا
ئـــەو دەســـتی نییـــە لـــە لێـــوی تـــۆ کـــاریێ کـــا
ئـــەو تـــەنگی و ناســـکیەی کـــە زارت هـــەیتی
ترســـــم لەوەیـــــە هەناســـــە زامـــــاری کـــــا

## ٤٢

کـــــوژراوی ئـــــەوین ئێمـــــە جیهـــــان کوشـــــتارگا
بـــێ ئـــاوو شـــەڕاب لێـــرە جیهـــان خـــواردن گـــا
بـــۆ ئێمـــە نییـــە هـــەوایی فیردەوســـی بـــەرین
بـــالاتر لـــە ئـــەم دۆزەخەیـــە ســـەیران گـــا

## ٤٣

پێـــت وا نـــەبـــێ هـــەر تاعەتـــە بـــەر بەســـتی بـــەلا
ئـــازاری دڵـــی گیانلەبـــەریێ کـــاری خـــەتـــا
تـــۆ چاکـــە بکـــە و بیبـــە لـــە چـــۆمی هـــاویێ
هـــەر دێتـــەوە ڕێ ڕۆژێ لـــە دەربـــاری خـــودا

٤٤

ئـــەو خوایـــە هـــەموو چێـــژی لـــە ســـەر ڕا دانـــا
بـــــۆ ڕووت و ڕەجـــــاڵانی لـــــە دنیـــــا دانـــــا
ئەوکـــەس کـــە لـــە خـــۆی دوور و بـــەرەو دوو ڕۆیـــی
زانســـــتی لـــــە نـــــاو ڕان و لـــــە نـــــاو پـــــا، دانـــــا

٤٥

دوێنـــــێ لـــــە دوعـــــابووم بـــــە دوو چـــــاوی مینـــــا
پاڕامـــــــەوە بـــــــۆ دیـــــــدە وو چـــــــاوی مینـــــــا
کـــــام دیـــــدەیی بـــــەدکارە لـــــە چـــــاوی داوی
دەک کـــوێر بـــێ دوو چـــاوی بـــە شـــکاوی مینـــا

٤٦

گـــەردوون تـــۆ گـــەلێک (لیـــل و نهـــارت) هێنـــا
گـــا فەســـڵی خـــەزان ، جـــارێ بـــەهارت هێنـــا
مـــەردانی جیهـــان گشـــتی لـــە ناخـــت ڕاکـــرد
نامـــەرد و دەغـــەڵ، ئـــەوەی بـــە کـــارت هێنـــا

٤٧

بــــۆو دێـــره کـــه چـــووم حـــازری دەســـتیان هێنـــا
لــــەم کۆنـــــه مەیـــــه ســـــاغەری پڕیـــــان هێنـــا
تــامی مەیەکــه خــۆمی لــه مــن بــێ مــن کــرد
بردیـــانم هـــەر ئـــەو دەم یـــەکـــی تریـــان هێنـــا

٤٨

دیـــدەم کـــه سروشـــکی تـــەڕ و ســـووری هێنـــا
بـــۆ هـــەر موژەیـــەک قـــەترەیێ خـــوێنی هێنـــا
ئێســـتا لـــه تەماشـــای تـــۆ دڵـــی پـــڕ خـــوێنم
ســـــینەی قەڵەشـــــاندوومه دەروونـــــی هێنـــــا

٤٩

هـــاتی لـــه شـــەش و چـــواری زەمانـــت بـــڕوا
بـــۆ هەشـــته لـــه دوو، ئەگـــەر بـــه مانـــت بـــڕوا
لـــه حـــەوت و لـــه ســـێ ڕۆژێ پـــەیامت بـــۆ دێ
پێنجـــی تـــۆ لـــه نـــۆ بـــۆ یـــەک و گیانـــت دەڕوا

٥٠

چۆن دەکرێ لە دڵ مەیلی ئەوینت بڕوا
یەکدەم هەوەسی ڕووی مەهینت بڕوا
هەر کەس دێ بە لای تۆوە دەبێ دڵ دانێ
چۆن دەکرێ لەگەڵ دڵ، لە کەمینت بڕوا

٥١

عاشق بۆ دەبێ غەم لە هەناوی بڕوا
تا گیانی لەبەر بێ تەب و تاوی بڕوا
وەک جیوە دەبێ ئەو دڵی نەرم و شل بێ
خوێنیشی بڕێژی تەب و تاوی نەڕوا

٥٢

دنیا کە دەڕوا مەینەتی دنیا دەڕوا
بۆ باوک و کوڕان نەماوە دنیا دەڕوا
تا تینت هەیە لە خزمەتی حەق دابە
ئەم داسی فەلەک دەمان دورێ بێ پەروا

٥٣

ئەم ژینە کە هەر دەمێکە دێت و دەڕوا
زۆرتر بە غەمە، کەم بە دڵی تۆ دەڕوا
بۆ بوون و نەبوون نابێ شەمۆڵەی بگری
گەر ژیر و بە بیر بی، بە دڵی تۆ دەڕوا

٥٤

هەر کەس کە لە ئەم دەرگەیە دێت و دەڕوا
هەر باری غەم و دەردە لەگەڵ ئەو دەڕوا
لەم ڕازە کەسێک نیشانی پێنەدراوە
ماستاو شلەکان دەیکەنە بگرە و بڕوا

٥٥

گەر بایی بە عومری بە تەبێکی دەڕوا
گەر شایی بە گەنجی بە شەوێکی دەڕوا
زۆرداری مەکە ڕەنج و دڵ ئازاری تۆ
ژێر لێوی کەسێک بە یارەبێکی دەڕوا

٥٦

خـــەییام بـــەدەنت ســـنەوبەری ڕوو بـــە هـــەوا
فەرمانـــدە ڕوحـــە و مـــەنزڵی ئـــەو داری بـــەقا
تـــۆ داری لەشـــت دەڕزی کـــە مۆرکـــەی لێـــدا
دەیخاتـــە ئـــەرز کـــاتێ کـــە ڕووحـــت دەڕوا

٥٧

مەنســـووری حـــەلاج تاقـــە نەهـــەنگی دەریـــا
وەختێـــک لـــە بـــەدەن گیـــانی جیـــا بـــۆوە جیـــا
ئـــەو ڕۆژە (انـــا الحـــق)ی لـــە ســـەر لێـــوی هـــات
مەنســـوور نـــەبوو ئـــەم جـــارە خـــودا بـــوو، خـــودا

٥٨

هـــیچ کـــەس لـــە ستەم بـــێ بـــەش و بـــێ وەی نـــەژیا
کـــەی پێکـــەنی گـــوڵ، ئـــاگر لـــە جەســـتەی نـــەدرا
بـــێ بڕانـــەوە هـــەر دێـــن و دەچـــن ئـــەم خەڵکـــە
جوابێـــک لـــە ســـەر ئـــەم بـــاس و وڵامـــەی نـــەدرا

*****

# پیتی (ب)

٥٩

دووری چ غەمێکە کە منی کردە کەباب
دەخولێمەوە لەو بەحری غەمت عەینی شەهاب
وا ئێستە وەکوو خار و خەشی دەریامە
جارجارە لەسەر ئاو دەگەڕێم عەینی حوباب

٦٠

ئـــەی زات و ســـیفاتت هـــەموو پـــاکن لـــە عیـــوب

یەکدانـــە لـــە ســـەد نـــاوی تـــۆ عـــەللامی غیـــوب

ڕوحمـــم پـــێ بکـــە تـــاوو تەمـــەن بـــەر بـــا چـــوو

نـــووح نیمـــە ئـــەمن نـــە لامـــە ســـەبری ئـــەییوب

٦١

ئـــەی ئاوێنـــەیی جـــووانی لـــە ڕوخســـارت زیـــب

گـــەرداوی ســـەدان کەشـــتی گـــەلی ســـەبرو شـــەکیب

هـــەر ئاوێنەیـــەک بـــەدەر لـــە ڕوخســـارت بـــێ

عەقڵـــە کـــە دەڵـــێ هـــەر ئـــەوە ســـەحڕایی فـــەریب

❋❋❋❋❋

# پیتی (ت)

## ٦٢

ئــــەو مانگەیــــە خاکنشــــینی قــــەدری دەرگــــات
دەســــتی مــــە لــــە بــــۆ دامــــەنی وەســــڵت ناگــــات
مــــن دێــــم و لــــە کــــۆڵانی تــــۆ خــــانوو دەگــــرم
بــــۆ ئاســــوودەیی خــــەیاڵی دووری ڕێگــــات

٦٣

گیــــانم بـــۆ ســـەری لێـــوم لـــە تـــۆ ڕا بـــۆ هـــات
لـــەم خونچـــەدەمـــەی تـــۆ بـــوو کـــە مـــەرگم بـــۆ هـــات
بیســـــتوومە دەڵـــێن ناڵـــە لـــە گـــوێی تـــۆ دایـــە
ناڵـــەی دڵـــی مـــن مەگـــەر لـــە بـــەر گـــوێی تـــۆ هـــات

٦٤

ئـــەو دەســـتە لـــە یـــەزدان کـــە خەبـــەریان بـــۆ هـــات
ڕازی ســـــەرەکی بـــــوون و نـــــەبوونیان بـــــۆ هـــــات
خـــــاوەن نـــــەزەران حەلقـــــە لـــــە گـــــوێی یـــــەزدانن
مـــەردان لـــە نزیـــک بوونـــە نـــەزەریان بـــۆ هـــات

٦٥

تیرێـــک لـــە کەمانخانـــەیی ئـــەبرۆی تـــۆ هـــات
پێکانـــــدی دڵ و خـــــەیاڵی وەســـــڵم بـــــۆ هـــــات
ڕەد بـــــوو لـــــە دڵـــم تیـــر و بـــەناز زوو فـــــەرمووی
دێوانـــــە نـــــەبی مانـــــەوە لای تـــــۆ هـــــەیهات

٦٦

تــا پەرچــەمی ئــەو شــا بێــت و ڕوخســاری تــەخت
دەیخاتــە ملــم پــەتکی هــەموو کــاری ســەخت
خســتوویە دڵــم لــە بارەگــەی تــەختی ڕوخــی
ڕۆژێــک دێ بڵــێم بوومەتــە کــوژراوی بــەخت

٦٧

ئــازادی لــە گــەڵ دەردی ئــەوینم نەخواســت
بــۆ بەنــدەگی دامنــا لــە هــەموو لایــەک خواســت
ئــەمجارە بــۆ وەی ڕازی لــە مــن بــێ یــارم
زارم لــە هــەموو بــاس و هەرایــەک پاراســت

٦٨

دەرگــاهی وەصــڵ بــوونی لەســەر مــن داخســت
دڵ گیــانی لــە غــەم بــۆ خــەوی مــردن ڕاخســت
ئێســتا کــە مــن و دەرگــەیی بەســراوی ئــەو
چێــژی لــێ ئــەبا خۆشــی بــە ڕووی مــن داخســت

٦٩

ئــەمرۆ دەمـــی مـــار و دەمـــی دووپشـــکم بەســـت
زار و دەمـــــی دوو بوونـــــەوەران لـــــێکم بەســـــت
شــەجنی قەرنــەینم لــە ســەر خوێنــدن و ڕزگــارم بــوو
بـــۆ نـــووحی نـــەبی ڕێـــز و ســـڵاوم هەڵبەســـت

٧٠

حۆریــان کــە بــۆ ســەیری یــاری مــن ســەفیان بەســت
دەیخســـتە ســـەری لـــە هەیبـــەتان (رضـــوان) دەســـت
دای خـــاڵی ڕەشـــی بـــە ســـەر ڕوخـــان دا پـــەردە
عـــەوداڵ لـــە تـــرس بـــۆ (مصـــحفان) بردیـــان دەســـت

٧١

ڕێگایەکـــە ئـــەم کەعبـــە دەمـــان باتـــە مەبەســـت
لـــەو لاوە لـــە مەیخانـــە دەڕۆن بـــادە بـــە دەســـت
ڕێگـــــا لـــــە هەموولایـــــەکی پـــــڕ ڕێبـــــوارە
ســـاقی ئەجـــەل و مـــەی لـــە دەس و پیاڵـــە بـــە دەســـت

٧٢

کاتێـک کـە نییـە چـی هەیـە هـەر بایـە بـە دەسـت
ئەوکاتــە هەیــە لــە چیــدا نییــە نوقســان و شکەســت
وە بزانـــــە نییـــــە هــــــەرچی لــــە عالــــەم دایـــــە
وا بیرکـــەوە چـــی نیتـــە لـــە عالـــەم دێ بـــە دەســـت

٧٣

دوێنـــێ بـــوو منـــاڵێ پیـــر و بێژینگـــی لـــە دەســـت
دەیــدا بــە ســەر و ڕانــی بــە مســتان و بــە دەســت
ناڵــــەی بــــوو بــــە هــــاوار و فغــــان و ڕۆ ڕۆ
مســتێکم نــەبێژت لــە نۆبــە، نوبــەم چــوو لــە دەســت

٧٤

ئــەی برەهمــەن ئــەی لالــە عــوزار لالــە پەرەســت
ڕوخســـاری جـــوانی چـــوارده ســـاڵانت پەرەســـت
هــەر نــەتبوو عــەقڵ تــا تــۆ خــودا پەیــدا کــەی
ڕۆژت نــە پــەرەست ســەیرە کــە گوێلپــارت پــەرەست

٧٥

ئەوکەس کە لە ڕێی عەشق و ئەوین خوێنی ڕشت
ئازادە لە مزگەوت و لە دێر و لە کەنشت
دێوانەیی عەشقی تۆ لە دوور و نێزیک
دۆزەخ چ بەهەشت سازە لەگەڵ کاری سرشت

٧٦

زێوینە هەواو وو ڕەنگی ژەنگاوی دەشت
یارم وەرە دامناوە لە بەر تۆ سەر و تەشت
گەر مەیلی وەفات ماوە ئەمە گیان و دڵ
قازانجێ دەکەم دووبارە مشت پڕ بێ لە هەشت

٧٧

ئەم بوونە هەموو ڕۆژێ لە کرداره لەشت
پێت خۆشە لە بوون بزانی لەم کارە لەشت
تۆ سەیری بلۆقی مەی کە بیبینە کە چۆن
ئەو مەی لە نێو مەی، ئەو لە نێو مەی ئەوە شت

٧٨

یار هات و وتی هەستەوە ماندووکە دڵت
خانەی منە ئەو ئومێدەواری کە، دڵت
ئێمەین کە دڵی شکاو لە بەر چاو دەگرین
ئێمەت کە دەوێ هەمیشە بشکێنە دڵت

٧٩

پێت وا نەبێ تا سەر بێ بەری مەیدانت
ئەنباری بکەی ماڵ و خەلە و خەرمانت
ڕۆژێک دێ بە ناچاری بە جێیان دێڵی
ڕووسوورییە ئەو ڕۆژە سەر و سامانت

٨٠

بێ پا و سەرانی دەشتی خوێن بارانت
مردوونە لە تاو دەرد و غەمی جارانت
میحنەت زەدەگانی خێڵی لەیلایی تۆ
بێ ئابڕو دەبن دێنەوە بەر دەستانت

٨١

گـــەر تـــۆ لـــە زوهـــد یارمـــەتی دەی ئیمانـــت
زینـــدانی بکـــەی لـــە پشـــتی پـــەردەی گیانـــت
ئـــازاری بـــەدەن نـــە زوهـــد و دینـــە، زاهییـــد
دووری لـــە عـــەقڵ، تـــۆ کـــە فڕێـــدەی گیانـــت

٨٢

نیشـــان مـــەدە دەردێکـــی نـــەبێ لـــە گیانـــت
خـــۆ پـــێش مـــەدە کـــارێکی نـــەبێ مـــەیـــدانت
هـــۆی بـــێ هونـــەری و شـــەرمە لەگـــەڵ گەوهـــەریان
بـــایی بـــی بـــە کـــانزایێ نـــەبی لـــە میانـــت

٨٣

لـــەش ســـاغی گـــوڵی عـــەشـــقەکە دەڕژا لـــە تـــەنت
ســـەد شـــوکر، بـــە گـــوڵزاری وەفـــا دا بـــەدەنت
تـــەب هـــات بـــە هەڵـــە بـــەڵام کـــە ڕێـــی کەوتـــە لەشـــت
وەک عـــارەقی گـــوڵ وا بـــوو کـــە دەڕژا لـــە تـــەنت

٨٤

عومرێک بە هەوەس بادی هەوام پاڵاوت
بۆ دەردەسەری خوێنی دڵم پاڵاوت
بۆ هەرچی دەسم برد غەمی دڵ زیاتر بوو
کێشامەوە دەست هاتە قەدی لاو لاوت

٨٥

بۆچی لە قسەی ئەم و ئەو ناکێشی چ خەت
دوو بوون نە دەلیلی دوور بوونی بە خەت
لەو گشتی هەبوون و ئەو جیهانی بێ غەڵەت
تاکێکی بە حەق بزانە زاتێکی فەقەت

❋❋❋❋❋

# پیتی (چ)

٨٦

ئەی دیار و نەهێنیی و مەکان بۆ تۆ هیچ
خاڵی لە گومان، بوونی گومان بۆ تۆ هیچ
بۆ زاتی تۆ نیشان و مەکان ناگونجێ
لەو جێیە کە تۆی، بوونی نیشان بۆ تۆ هیچ

٨٧

ئـــەی لەگـــەڵ ڕووت نـــووری ئـــەنوەر هـــەموو هـــیچ
بـــۆ لێـــوی تـــۆ سەلســـبیل و کەوســـەر هـــەموو هـــیچ
زۆر باشـــم دەدیـــت بـــەڵام کـــە چـــاکم ڕووانـــی
بینـیم کـە هـەموو ئـەتۆی، ئـەوەی تـر هـەموو هـیچ

٨٨

دەروێشـــی ئەگـــەر، پەنجـــە مەبـــە تـــۆ بـــۆ هـــیچ
شـادی مەکـە هـیچ، چنـۆک مەبـە تـۆ بـۆ هـیچ
ڕازی بـــە بـــەوەی ئێســـتە لـــە مڵکـــی ئـــەو دای
دنیـــات کـــە دەچـــێ ئاخیرەتـــە بـــۆ تـــۆ هـــیچ

٨٩

دەروێشـــی بکـــە و هەڤاڵـــەتی شـــا مـــەکـــە هـــیچ
تـــۆ دامـــەنی فـــەقرت هەیـــە قـــەت مەیـــدە بـــە هـــیچ
بـــۆ زاری نەهـــەنگ بـــڕۆ بژێـــو پەیداکـــە
دانیشـــە لـــە مـــاڵ مـــەقامێ مـــەخوازە بـــە هـــیچ

*****

# پیتی (ح)

٩٠

شـوكری تـۆ دەكـەم لـە، گشـــت (مَســـاءٍ وَ صَـــباح)

ئـەی خوایـە نـەجاتم دە لـە غـەم ، (مِنـــكَ فَـــلاح)

لای تۆیـــە كلیلـــی، (كُـــلُّ بـــابٍ رَبِّـــی)

دەی بـــۆم بكـــەوە دەركـــی، (فُتَـــوحٍ و فَتـــاح)

*****

# پیتی (د)

٩١

یــادی تــۆ دەکــەم دێ لــە دڵــی مــن فــەریاد
نــاوی تــۆ دەبــەم تێکــەڵی داد و فــەریاد
ڕۆیــی تەمــەنم گشــتی لــە ســەر بێهــوودە
چەنــد خاکــە ســەرم تــازە دەکــەم تــۆ فــەریاد

**٩٢**

غـــەم دام ئـــەگرێ کـــاتێ هەڵـــەم دێتـــەوە یـــاد
بـــۆ شـــەرمی گوناهانـــە کـــە تـــۆم دێتـــەوە یـــاد
دێ دەنگـــــێ لـــــە غەیبـــــەوە هـــــای دەروێـــــش
ئـــازادت دەکـــەم تـــۆ کـــە منـــت دێتـــەوە یـــاد

**٩٣**

ڕۆژم بــــە غــــــەمی دەردی دەروونـــــم ڕابـــــرد
شـــەو بـــۆ هەوەســـی بـــوون و نـــەبـــوونم ڕابـــرد
ژیـــنم کـــە لـــە ئـــەو دەمێکـــی دنیـــای دێنـــا
بێهـــــوودە وو بـــــێ دەراوی ڕوونـــــم ڕابـــــرد

**٩٤**

ئەفســـووس کـــە ڕۆژگـــاری جـــووانی ڕابـــرد
دەورانـــــی نیشـــــات و کامـــــەڕانی ڕابـــــرد
تینـــوو لـــە پـــەنا جۆگـــە و دەریـــا نوســـتم
تـــا ژیـــن و ژیـــانم بـــە نـــەزانی ڕابـــرد

٩٥

گــوڵ نەخشــی لــە ڕووی تــۆبــوو کــە بــۆ بــەرگی بــرد
ئاوێنـــەیی ڕووی تـــۆ بـــوو کـــە دڵ وێنـــەی بـــرد
هـــەر مـــاڵێ کـــە شـــەمعی ڕووی تـــۆی بـــۆ چـــوو
ڕۆژ چـــوو بـــە دزی لـــە ڕۆژنـــەوە نـــووری بـــرد

٩٦

گـــەر دوژمنـــی مـــن عـــەیبی لـــە مـــن پەیـــدا کـــرد
مـــەمنوونم کـــە ئـــەو کـــاری لـــە جێـــی خـــۆ دا کـــرد
تـــاجی ســـەرم ئـــەو خاکـــە لـــە ژێـــر پێـــی مـــەردێ
دیـــدەی منـــی ئـــەو بـــە عـــەیبی مـــن بینـــا کـــرد

٩٧

ئـــەی دیـــدە منـــت بـــۆچی ئـــەوا ڕیســـوا کـــرد
دێوانـــە لـــە تـــاو چـــاوی ڕەشـــی لـــەیلا کـــرد
کارێکـــت بـــە مـــن کـــرد کـــە لـــە زارم نایـــە
ڕۆژت لـــە ســـەر ئاســـۆیە لـــە مـــن ئـــاوا کـــرد

٩٨

لانـــەی دڵەکـــەم بـــەو غەمـــە نیشـــانت کـــرد
فێـــری تـــەڕەب و عاشـــقی ئیمانـــت کـــرد
شـــەش دانگـــی دڵـــم پـــڕ لـــە سـەفایە ئێســـتا
خـــاوەن ســـەنەم و خـــاوەنی ســـامانت کـــرد

٩٩

یـــاڕەب، مـــن ئەگـــەر گونـــاهی بـــێ حـــەددم کـــرد
گشـــتی هەڵـــە بـــوو هـــەرچی بـــە ناحـــەققم کـــرد
ئێســـتا کـــە لـــە هـــەر کـــارێ دژی مـــەیلت بـــێ
هاتوومـــە بڵـــێم، بـــە ڕوو ڕەشـــی تۆبـــەم کـــرد

١٠٠

هـــەر چەنـــدە کـــە دڵ لـــە وەســـڵە شـــادانم کـــرد
بینـــیم ئـــەوە خـــاترت پەرێشـــانم کـــرد
خـــووم گرتـــووە بـــە دووری تۆلـــە بـــەر خۆشـــی تـــۆ
زەحمـــەت بـــۆ منـــە، لـــە بـــەر تـــۆ ئاســـانم کـــرد

١٠١

ئـــەودەم کـــە لـــە ڕێـــی عاشـــقی مـــەنزڵمان کـــرد
ســـۆزێک بـــوو لـــە ئـــاگر لـــە دڵـــی خۆمـــان کـــرد
لـــەم شـــارە لـــە ئێســـتاوە لـــە چـــاوم دەگـــرن
ئـــەم نـــاوە هـــەموو لـــە عـــەشـــقە پەیـــدامان کـــرد

١٠٢

ئێمـــە ســـەفەری ڕایـــەخی هەســـتیمان کـــرد
خۆمـــان نەشـــکاند خـــودا پەرەســـتیمان کـــرد
مـــەی وصـــڵی تـــۆ بـــۆ ئێمـــە بـــە چـــاکی دەی خـــوا
ئـــەی تـــف بـــێ لـــە ڕووی مـــەی، کـــەزوو مەســـتیمان کـــرد

١٠٣

ئـــەم چـــاوە منـــی عاشـــقی یـــارێکی کـــرد
عاشـــق بـــە دەمـــی لالـــە عـــوزارێکی کـــرد
کـــارێکی بـــە مـــن کـــرد کـــە لـــە زارم نایـــە
الله ، الله ، وەک شـــەوە کـــارێکی کـــرد

١٠٤

داغـــــت لــــە دڵـــم دابـــــوو دەنـــــا دەمدۆڕانـــــد

دوو دیـــدە لــــە ڕێـــی تۆبـــوو، دەنــــا دەمکۆڵانـــد

دڵ مـــەنزڵی تۆیــــە ئـــەر نــــە ڕۆژێ ســـەد جـــار

بــۆ تــۆ بـــە وێنـــەی مـــزەللـــەکی دەمســــووتاند

١٠٥

ئـــەو ڕۆژە کـــە یـــار هاتـــەوە پـــەیمانی شـــکاند

دوو دەســـــتم بــــە گریانــــەوە دامــــانی ســــتاند

فــــەرمووی مەگــــەر ئــــەم جــاره لــــە خــەو بمبینـــی

مــەعلوم بــوو لــەدیــدەم خــەوی یــەکجاری ڕفانــد

١٠٦

بێشـــک ئەلیفـــە ئەحـــەد لـــە ئـــەو خـــوازە مـــەدەد

ئەحمـــەد لــــە ئـــەوە شـــاهیدە لـــەم کـــارە ئەحـــەد

بــۆ ئێمــە موحەمــمەد بــوو کـــە ڕۆیـــی مـــەحموود

فــــەرمانی ئــــەوە بڵــــێن: هُــــــوَ اللّهُ احَــــــد

١٠٧

لایـــەک لـــە ڕوخـــت، اَلَســـــــتُ مِـــــنکُم بِبَعِیـــــد
لایێکـــــی تـــری، اِنَّ عَـــــــــذابِی لَشَـــــــدِید
دەوری قەمـــەرت کتێبـــی، یُحیِـــــــی وَ یُمِیـــــــت
عاشـــق لـــە ئـــەوین بمـــرێ، فَقَـــد مَـــاتَ شَـــهِید

❋❋❋❋❋

# پیتی (ر)

١٠٨

تا کەنگێ قسەی قامەت و دوو زولفی نیگار
تا کەی بە هەوای ماچی دەم و لێوی نیگار
گەر ناکەی درۆ عاشقی بۆ چاوی خومار
بۆ عیشقی خودا لادە لە دڵ بەزمی عوزار

١٠٩

وا هاتەوە لام قاسدی ئەو بەژنی چنار
دەس خاڵی نەبوو دامەنی پڕ بوو لە هەنار
هاتم ڕوومەتم زوو لە هەنارێ ماڵی
یانی کە ئیتر بوومە ڕەقەم بۆ دڵی یار

١١٠

بەرماڵ بە سەری ئێمە لە من دەگرێ کەنار
ناقووس ژەنی بێچارە لە من هەڵدێ بە غار
وا چاکە منیش تۆڵە لەوان بستێنم
تەسبیحەکە نێو ئاگر و ئاگر خەمە زننار

١١١

هەر قەترە لە گریانی شەوم دێتە خوار
وەک ڕەستە لە ئەستۆمی دەکەم گەوهەروار
کۆیان کەمەوە گشتی لە سەر دەست دانێم
دەیهۆنمەوە بە ئومێدەوە دەیبەم بۆ یار

١١٢

چـــاوی منـــە بـــێ نـــوورە لـــە تـــاو دیتنـــی یـــار
یـــاقووتی ڕژا دیـــدە لـــە تـــاو شـــۆخی عـــوزار
ڕوخســـاری لـــە نـــاو ســـەیلـــی سروشـــکم بینـــی
نەخشـــێکی عـــەجیب دەرچـــوو لـــە ئـــاو ئـــاخری کـــار

١١٣

بـــۆ زیکـــری خـــودا چـــی؟ لـــە زمـــانن چـــاتر
تاعـــــەت بـــــە دزی نیـــــوە شـــــەوانن چـــــاتر
گـــەر پـــردی ســـیراتت گەرەکـــە، لـــەو دەرچـــی
تێـــرکردنـــی ئـــەم خەڵکـــە بـــە نـــانن چـــاتر

١١٤

پشـــتت چ گـــەرم کـــردوە بـــە سـامان و بـــە زۆر
یەکســـان لـــە مـــەزاقی تـــۆ چ شـــیرین و چ شـــۆر
لـــەولا لـــە ئـــەوین هەرایـــە گـــوێی تـــۆ بـــووە کـــەڕ
لـــەم لاوە جیهـــان پـــڕ لـــە هونـــەر بوویەتـــە کـــۆر

١١٥

ئـــەی لـــە تـــاوی تـــۆ لـــە عالـــەم شـــەڕ و شـــۆڕ
زل هێـــز و نـــەبوو کـــێ هـــەیـــە تـــۆ نەیخەیـــە گـــۆڕ
ئـــەی لەگـــەڵ هـــەموو لـــە گفتگـــۆو، گـــوێی هـــەموو کـــەڕ
وەی لەگـــەڵ هـــەموو لـــە کـــۆڕ و دیـــدەی هـــەموو کـــۆر

١١٦

ئەمڕۆکـــــە مـــــنم بـــــە زۆری بـــــاهۆ مـــــەغرور
بـــێ وێنـــە مـــنم ئێســـتە لـــە عالـــەم مەشـــهوور
هـــــەر وێنـــــەیی زمـــــڕووتم، نـــــەیارم ئـــــەفعی
بڕوانـــێ لـــە مـــن بۆتـــە زوغـــالی کـــافوور

١١٧

ڕۆژ کـــاتێ لـــە ئاســـمانێ دەدا پەرچـــەمی نـــوور
پڕشـــەنگی ئـــەوە خیـــرە دەکـــا دیـــدە لـــە دوور
کاتێـــک لـــە هـــەور دێتـــە دەرێ پڕشـــەنگی
فَالنَّـــاظِرُ یَجتَلِیـــهِ مِـــن غَیـــرِ قُصُـــور

١١٨

یـــــارەب، بــــە دوو ئـــــەولاد و نـــــەوەی پێغەمبـــــەر
یـــــانی بــــە دوو شــــــەمعی خانــــەوادەی حەیــــدەر
دۆڕاوە دڵـــــم، تـــــۆ بەکــــــەرەم ســـــەیرم کــــــە
چـــــاوم لەوەیـــــە بمخەیــــە ژێــــر چـــاوی نــــەزەر

١١٩

هیناویــــە شــــەماڵ گوڵێــگ لــە گوڵشــەن لــە ســـەحەر
یـــا ڕووحـــی قـــدوس شـــاپەڕی کێشـــاوە بـــە ســـەر
یـــا لـــەتکێ لـــە ڕووی مانگـــە بـــووە شـــەققی قەمـــەر
یــــا نامــــەیی ئــــەو یارەیــــە هیناویــــە خەبــــەر

١٢٠

بـــۆ بـــــەزمی شـــــەوت لێـــرە مـــــنم لاڵ و ئەســــیر
بــۆ کوشـــتی مـــن نیتـــە بـــە زاهیـــر تەقســـیر
لـــــەو لاوە قســــەت یـــــانی لـــــە داخـــــت بمـــــرە
ڕوو ناکەیـــە مـــن، یــــانی مـــنم دیــــل و ئەســــیر

١٢١

شمشــــیره کـــەمانی چـــاوی ئـــەو شـــۆخی مـــونییر
وەک بیوەڵـــەشـــێر خـــوێن مـــژە لـــە جیـــاتی شـــییر
لایـــەک وەکـــوو شـــێر لایـــەکی وەک شمشـــییره
هـــاوار لـــە دڵـــم لـــە زاری شـــێر و شمشـــییر

❋❋❋❋❋

# پیتی (ز)

١٢٢

ئەی ڕازت لە ناوسینگی ئەوەی مەحڕەمی ڕاز
دەرگەی کەڕەمت واڵەیە بۆ ڕاز و نیاز
هەرکەس کە بە گریانەوە دێ بۆ دەرگا
دەستی کەڕەمت ڕازی دەکا دەستی نیاز

١٢٣

گەر چاوی جوان بگێڕێ ئەو شۆخە بە ناز
بیماری وەخۆ دێتەوە بۆ ڕاز و نیاز
جوانی تۆ ئەگەر جیلوە بکا بۆ عارف
هوشیاری دەکا نووری حەقیقەت لە مەجاز

١٢٤

دوێ شەو من و ئەو بوتەی بەندە نەواز
پاڕانەوە ئی من بوو ئەویش چەندە بە ناز
شەو شەق بوو ڕەوایەتی ئەوین بێ کۆتا
شەوگار چ گوناهی کە منم تشنە بە ڕاز

١٢٥

هەر ڕۆژ سەحەری دێمەوە بۆ عەرزی نیاز
لەو دەرگەیی تۆ پانی دەکەم دەستی نیاز
بێ میننەتی بەندەگانی خۆت بەندە نەواز
قەت پێوەمەدە لە ڕووبەڕووم دەرکی نیاز

## ١٢٦

تـــا دیـــارە لـــە مـــن صـــورەتی ئـــەو شـــەمعی نیـــاز
تاعـــەت بـــە کـــەلک نایـــە، لـــە بـــەر ڕازی نیـــاز
ئەوکاتـــــە لـــــەگـــــەڵ تۆمـــــە موجـــــازم نـــــوێژە
ئەوکاتـــە کـــە بـــێ تۆمـــە، نـــوێژ گشـــتی مـــەجاز

## ١٢٧

عـــەشـــقی تـــۆ نـــەبێ، نایـــە بـــە دڵمـــا هـــەرگیز
باســـی تـــۆ نـــەبێ، نایـــە بـــە دەم مـــا هـــەرگیـــز
ســـــەحرایی دڵـــــم کـــــردوە بـــــە شۆرســـــتانێک
تـــا عـــەشـــقی کەســـێ نـــەڕوێ لـــە ئـــەو دا هـــەرگیز

❋❋❋❋❋

# پیتی (ژ)

١٢٨

دڵ خەستە وو زامدار و مژۆڵک خوێن ڕێژ
ویستم بگەڕێم تاوێ جیهانی خوێن ڕێژ
گەرمم نەکرد جێگا، بە سەرم دا گەردوون
نەڕڕاندی، وتی: کاتت بە سەر چوو ئەی گێژ

*****

# پیتی (س)

۱۲۹

(الله) یە بۆ هاواری منی بێکەس بەس
چاکە و کەڕەمی ئەو بۆ منی بێکەس بەس
هەر کەس بەکەس و بە حەزرەتێ شانازە
هەر حەزرەتی الله، بۆ منی بێکەس بەس

١٣٠

نـــەورۆزە جیهـــان هاتـــەوە بـــۆ گیـــانی نەفـــەس
خەملاّنـدی لـە بـاغ لالـە سـەری عـەینی جـەڕەس
کـــاروانی بـــەهار هـــاتوو بـــە مـــاتی ڕۆیـــی
هـــەر غـــەم بـــوو بـــەهاری تەمـــەنم حاصـــڵی بـــەس

١٣١

بـــۆ هەرکەســـی کـــەس، لـــە ناکەســـانیش ڕا کـــەس
قـــەترێک کـــەڕەمت لـــە ئاســـمانیش ڕا بـــەس
ئـەی خوایـە لـە ڕاسـت گـەورەیی تـۆ چەنـد کـاڵم
نـــەک قـــەترە بـــە زەڕڕە لـــە جیهـــانیش ڕا بـــەس

١٣٢

بـۆ بـێ کەسـی کـەس، هـەر تـۆ کەسـی بـۆ ناکـەس
قـــەترێک کـــەڕەمت لـــە عالـــەمی دنیـــا بـــەس
مـــن بێکـــەســـم و تـــۆ بێکەســـان ڕادەگـــری
یـــاڕەب، تـــۆ بـــۆ هـــاواری منـــی تـــەنیا بـــەس

## ١٣٣

ئـــەی ئاوێنـــە لـــە جـــوانی تـــۆ زاتـــی هـــەر کـــەس
نـــەینووکی ســـیفاتی تـــۆ ســـیفاتی هـــەر کـــەس
لـــە ســـتۆم دەگـــرم ژەنگـــی گونـــاهی هـــەر کـــەس
بینووســـە لـــە ســـەر شـــانم، گونـــاهی هـــەر کـــەس

## ١٣٤

ئـــەی ئاگـــا بـــە گشـــت ڕازی دەروونـــی هـــەر کـــەس
هـــەر تـــۆی کـــە دەگـــەی زووتـــربـــەیـــاری هەرکـــەس
یـــاڕەب، تـــۆ بـــە مـــن تۆبـــە بـــدە و بمبـــوورە
تـــۆ، تۆبـــەدەر و تۆبـــەبـــەری بـــۆ هـــەر کـــەس

## ١٣٥

ئـــەی ئـــەوکـــە ئـــەتۆی مـــەحرەمی ڕازی هەرکـــەس
شـــەرمەندەیی نـــازی تـــۆ نیـــازی هـــەر کـــەس
چـــون دوژمـــن و دۆســـت هـــەر دوو نیشـــانەی تۆیـــە
ئەیکێشـــم لەبـــەر ڕێـــزی تـــۆ نـــازی هـــەر کـــەس

١٣٦

هــاوار کــە لــە ئــەم ناڵــە وو تاســەم بــێ کــەس
هــــاوڕێم نییــــە لــــەم ڕێیــــە درێـــژەم بــــێ کــــەس
نــــاخی دڵـــــی مــــــن جــــــەواهێراتی تێـــــدا
بــۆ مــەحرەمی ئــەم ڕازە بــە تاســەم بــێ کــەس

١٣٧

ئــەی چــاوی دڵــم، ئەگــەر تــۆ بینابیــت هــەس
بــۆ کــاری جیهــان گشــتی کــە ســەودایە و بــەس
دانیشـــــە لــــە گۆشـــــەیەک لـــــەم و لــــەو لادە
هــەر ئــەو بەســە بــۆ تــۆ بــێ، لــە تــەنیاییت بــەس

١٣٨

کــەی لــە زەرەری کــار و عەمــەل ترســم هــەس
کــەی لــە هەڵــەکانی تەمــەنم ترســم هــەس
ترســـم لــــە گونــــاهم نییــــە بەخشـــین زۆرە
لــــەو ســــابیقەیی ڕۆژی ئــــەزەل ترســــم هــەس

## ١٣٩

پێت وانەبێ من لە ئەو جیهان ترسم هەس
یا مردن و ڕۆژی ئەجەلم ترسم هەس
مردن کە لە ڕێگامە لەوی ناترسم
من خۆ دەپەرەستم و لەوەی ترسم هەس

❋❋❋❋❋

# پیتی (ش)

١٤٠

زاتی تۆ نەرێنی بووە ئەی خاوەنی هۆش
نیسبەت مەدە تۆ، کردە بەلای خۆ، خامۆش
شیرین وتەیەک هەیە دەبێ بیزانی
ئەوکەس کە نەبێ شەرمی لە حەق زاتی نەخۆش

*****

# پیتی (ع)

١٤١

ئاگـــا بــووی بــه زانســـتی مواقـــف ، قـــانع
بــووه (قصـــد)ی مــەڕامت لــه (مقاصـــد) مـــانع
تـــا هەڵنـــەگری پـــەردە بـــۆ شـــەرمت، نـــابێ
پڕشـــەنگی حەقیقـــەت لەســـەر ئاســـۆ طـــالع

❋❋❋❋❋

# پیتی (ق)

١٤٢

بــۆم بۆتــه بــه ئــایین و بــه دیــنم هــهموو عــهشــق
ڕایــهخ لــه غــهم و دەردە، ســهرینم هــهموو عــهشــق
سُــــــبحان الله، ڕوویــــهک و گشــــتی جــــوانی
اِنَّــــا لِله، یــهک دڵ و ژیــــنم هــهموو عــهشــق

١٤٣

بـەر تـاری دڵـم خشـاوە یـەک نەغمـە لـە عـەشـق
یـەک جـاری دەروون، پڕبـووە بـەم نەغمـە لـە عـەشـق
خـــۆ تـــازە لـــە ژێـــر بـــاری منـــەت دەرنـــاچم
بـۆ جـوابی سوپاسـگوزاری ئـەو نەغمـە لـە عـەشـق

١٤٤

دڵ کـردی گـەلێک سـەیر لـە نـاو دەفتـەری عـەشـق
ڕووی یـاری نـەبێ نەیـدی چ ڕوو،شـایەنی عـەشـق
هێنـدەی کـە جـوانتر بـی لـەوەی ئێسـتا هـەی
شـەیدایە دڵـم ئـەوین دەخاتـە سـەری عـەشـق

١٤٥

تـۆ بڵێـی کـە ببـێ لیباسـی بـوون، ڕۆژێ شـەق
نـووراني ببـێ جـەماڵی وەجهـی (مطلـق)
بـێ شـوێن بـێ دڵـم لـە نـووری ئـەو دا ون بـێ
گیـانم لـە تـەوژمی شـەوقی ئـەو دا بـێ غـەڕق

# پیتی (ک)

١٤٦

گەر لوتفێ بکەی نیمە لە عالەم هیچ باک
گەر داد بکەی دەبم بە جارێ هیلاک
ڕۆژانە دەپاڕێمەوە ئەی خالقی پاک
مستێکم لەخاک، چی دێ لەدەست مستێ خاک

١٤٧

ئـەو خەڵکـە لـە دەرگـاهی تـۆ ئـەی خـالقی تـاک
وەسـتاون لـە تـاو دڵۆپەیـەک ئـاوی پـاک
فـەرمان بکـە بـەم هـەورە لـە لـوتفی تـۆڕا
ئـاوێکی بڕێـژێ بـۆ سـەری مسـتێ خـاک

١٤٨

پـاک هـاتووە ئـەم عـەشـقە بـە داوێنـی پـاک
ئـەم نـوورە نیـازی نییـە بـۆ مسـتێ خـاک
خـۆی جیلوەگـەر و هێـز و ووزەی گشـتی بـوون
ئێمـەش کـە نـەبین ئـەو لـە هـەموو شـت بـێ بـاک

١٤٩

سـەودایی دڵـی بـێ سـەر و سـامان لایـەک
بـێ ڕەحمـی زەمـان و چـەرخی دەوران لایـەک
خوێنـاوی دڵـی لـەت لـەت و زوێڵـم لایـەک
گشـتیان لـە لایـەک ، غـەمی تۆمـان لایـەک

١٥٠

مـــن کێمـــە؟ لـــە خـــۆ تـــازە وەتـــەنگ هاتوویـــەک
شـــێتێکی لـــە گـــەڵ عـــەقڵی بـــە شـــەڕ هاتوویـــەک
دوێ شـــەو بـــوو لـــە کـــۆڵانی تـــۆ غیـــرەت گرتمـــی
بـــۆ ناڵـــەی دڵـــی زووتـــر لـــە مـــن هاتوویـــەک

١٥١

ئـــەی ئـــەو کـــە هـــەمووحاجـــەت و ڕووحـــم (بیـــدیک)
بامـــداوە لـــە هـــەرچی هەیـــە ڕووم کـــردە (علیـــک)
خـــۆ کـــــردەوە هـــــەر نیمـــــە (لاســـــتظهر بـــــە)
بـــۆ تـــۆم هـــەڵێنا هـــەر دوو دەســـم (خـــذ بیـــدیک)

١٥٢

قـەت نەمـدی غـەمێک کـەم بـێ لـە بـۆ مـن جارێـک
غـەم بـۆ هـەموو کـەس قـەترە لـە بـۆ مـن بارێـک
هـــەر شـــادی لـــە عالـــەم ڕوو لـــە شـــاری مـــن کـــا
بـــۆ عالـــەم وەکـــوو بـــەحرە لـــە بـــۆ مـــن خارێـــک

١٥٣

گیانە لە وڵاتی خاوەران کوا خارێک
من سوورم نەکرد بێتن لە خوێن دا جارێک
من چاوم لە ڕوحم و لە جەماڵی تۆیە
چۆن لاڕێ دەبم لە دانی دڵدا جارێک

١٥٤

لە گوڵاڵە و حەمرین و لە مەندەل خارێک
نەڕواوە مەگەر بۆ دڵ و بۆ دڵدارێک
هەر جێیە هەبێ خونچەدەم و گوڵ ڕوخسار
شایانی ئەوین ئێمە و موشکیل کارێک

١٥٥

ئەی خالقی هەر جانەوەر و بوونەوەرێک
ئەی ڕازقی هەر باخەبەر و بێخەبەرێک
بەستوومە ئومێد بە تۆو لە دەرگاهی تۆم
دەرگا بکەوە لە خۆوە نیمە هونەرێک

١٥٦

یا بۆ ملی ڕۆژگار و زەمان زنجیرێک
یا ملهوڕ و زۆرداری زەمان تەدبیرێک
زۆر بەرزە فڕن قالە قڕانی ئێستا
بەردێک لە دەمیان یا لە هەوا نیم تیرێک

١٥٧

ڕێبەر لە دوعای خەڵکی موسڵمان ترسێک
لەو سۆزی دڵ و ئاهی بەیانان ترسێک
بەم هێز و سپا و لەشکرە بایی مەبە تۆ
بۆ هاتنی سێلاوی پەرێشان ترسێک

١٥٨

بۆ بەحری یەقین تاقە ڕێگاییێک و کەسێک
هەر مەوجەکی گەرداوەکە، کەشتی نەفەسێک
هەر گوێ سەدەفێ حەلقەیی چاوی پڕ ئاو
ئاماژەیە هەر مەوجێ بە ئەبرۆیی کەسێک

١٥٩

ئـــەی نـــاو دڵـــی هەرکـــەس لـــە خـــەیاڵت هەوەســـێک
بـــێ مـــەیلی تـــۆ دەرنایـــە لـــە ســـینەم نەفەســـێک
مەفرۆشـــە مـــن و بـــە هـــیچ نەکـــەی ئـــازادم
تـــۆ بەنـــدە گـــەلێکت هەیـــە مـــن خواجـــە یـــەکێک

١٦٠

لایـــــداوە نیگـــــاری مـــــن، نقـــــابی تـــــەڕەفێک
ڕایمـــــاڵی بـــــەیان پـــــەردەیی تاریکـــــەشـــــەوێک
گـــەر نـــابێ قیامـــەت ئەمـــە چیـــە ڕوویـــداوە
مـــانگی تـــەڕەفێک خـــۆر و هـــەتاوی تـــەڕەفێک

١٦١

یـــــا پەســـــت و بڵنـــــدایی زەمانـــــە کوتکێـــــک
یـــا خـــار و خـــەش و زۆڵـــی زمانـــە گەســـکێک
گیـــــراوە دڵـــــم لـــــە زوڵمـــــی زاڵـــــم یـــــاڕەب
گـــۆڕیین و لـــە نـــاوبردنی وانـــە ســـووکێک

## ١٦٢

چرپانـــدی لـــە غەیبـــەوە لـــە بـــەرگویم دەنگێـــک
مانـــدووی مەکـــە دڵ بێنـــە دەریکـــە ســـووکێک
ئـــەی خوایـــە لـــە بـــەر خـــاتری دۆســـتانی خـــۆت
مەســـتێنەوە لـــیم بـــێ ئـــەوی نـــاژیم ســـاتێک

## ١٦٣

ئـەی بـۆ هـەر گوڵێـک لـە بـاغ لـە تـۆ ڕا ڕەنگێـک
ئـەی بـۆ هـەر مـەلێک سـەدا و لـە تـۆ ڕا دەنگێـک
بـــەم کێـــوە لـــە بـــەر غـــەمی تـــۆ ڕەمـــزێکم وت
هـــەر ناڵـــە بـــوو هەســـتا لـــە دڵـــی هـــەر ســـەنگێک

## ١٦٤

سەرتاســـەری خـــاوەر نییـــە بـــەرد و ســـەنگێک
لـــە خـــوێنی دڵ و دیـــدە نـــەبێ لـــەو ڕەنگێـــک
ئێســـتا لـــە هـــەموو شـــار و هـــەموو کۆڵانێـــک
دامـــاوە لـــە تـــاوی غـــەمی تـــۆ دڵتـــەنگێک

١٦٥

گـــەر کـــۆی تەمـــەنی تۆیـــە فریوێـــک و دەمێـــک
هـــاوار مەکـــە زوو، گـــەر هـــەموو لایـــەک ســـتەمێک
بـــاییش کـــە مەبـــە، تـــەواوی ژیـــانی مـــن و تـــۆ
شـــوعلێک و نەســـیمێک و غوبارێـــک و تـــەمێک

١٦٦

ژیـــن دەمێـــک و ژان دەمێـــک و دنیـــا تاوێـــک
بـــۆ پەســـت بـــم و گـــوێ لـــە مستی هـــەر ناپیاوێـــک
کـــارم بـــە دوعـــا ســـەری نـــەگرت وا چاکـــە
ڕابـــوێرم بـــە ســـەربەرزی بـــە نـــان و ئاوێـــک

❋❋❋❋❋

# پیتی (گ)

١٦٧

بۆ عەشقی تۆ ئەی نیگاری پڕکین و جەنگ
سووڕامەوە لەم جیهانە گێژ و دڵ تەنگ
دەست شل بوو لە کار و قاچەکانم بێ هێز
هەر دام لە سەرم تاکوو سەرم پێکای سەنگ

١٦٨

دەستم کە لە زولفی تۆ بە ناز بردی چەنگ
چاوم کە بە دیتنت لە دڵ بردی ژەنگ
بەستوومە بە خوێن بێ تۆ لە ئێستا چاوم
ئێستا کە، لە سەر خۆمی ئەدەم دەستی سەنگ

١٦٩

بەم ڕەنگەوە نیمە لە موسڵمانی ڕەنگ
ئەی چاتر لە من سەگانی خەڵکانی فەرەنگ
ئەو ڕووڕەشەمە پێم وەیە ئەو ڕۆژەم دێ
دۆزەخ ئەڵێ من عارم لە سووتانی نەنگ

❋❋❋❋❋

# پیتی (ل)

١٧٠

یارەب بە عەلی ئیبنی ئەبی طالب و ئال
ئەو شێری خودا و خاوەنی ویژدان و کەمال
فریام بکەوە لە سێ مەکان و سێ شوێن
کاتی سەرە مەرگ و گۆڕ و هەم کاتی سوئال

١٧١

هـــەر ســـیفەتەکی نایـــە ژمـــاری لـــە کـــەمال

ئـــەو تایبەتـــە بـــۆ زاتـــی بـــەڕێزی موتـــەعال

وەســـفێک لـــە حیســـابی ســـتەم و شـــەڕ دابـــێ

لایـــق بـــە قســـووری عەدەمـــە ئـــەو لـــە مـــەئال

١٧٢

بـــۆ بچمـــەوە بـــاغ کـــە لـــەو دەنـــاڵێ بولبـــول

بـــێ تـــۆم بۆچییـــە جیلـــوەیی ســـەر وو ســـونبول

بـــەژنی تـــۆ وەکـــوو ســـەروی بڵنـــد و بـــەرزە

بـــێ نرخـــە لـــە ڕاســـتی تـــۆ گـــوڵ و بـــۆنی گـــوڵ

❃❃❃❃❃

# پیتی (ڵ)

١٧٣

کاتێک کە دەسووڕێتەوە گەردوون سەری ساڵ
داڵانپەڕی ڕازاوە دەکا لالەیی ئاڵ
ئەو کاتە کە یار لە پەردە خۆ دەنوێنێ
وەک وێنە لە حاڵی منە ئەو وێنەیی حاڵ

١٧٤

ئـــەی چـــوارده تەمـــەن تـــازه گەیشـــتوو بـــە جـــەماڵ
ئێســـتا کـــە وەکـــوو هـــەیڤی چـــواردەی بـــە کـــەماڵ
یـــارەببی نـــەگا بـــە جـــوانی ئـــەم حـــۆره زەواڵ
لـــە چـــواردەوه عـــومرو تەمـــەنت بـــێ ســـەد ســـاڵ

١٧٥

دەی پرســـی کەســـێک مـــەنزڵی ئـــەو یـــاره لـــە دڵ
پـــێم وت کـــە بـــۆ ئـــەو یـــاره ســـەراپەردەیە دڵ
دەیـــوت کـــە دڵـــت لـــە کوێیـــە پـــێم وت لای ئـــەو
دەیـــوت کـــە ئـــەوت لـــە کوێیـــە پـــێم وت: کـــە لـــە دڵ

١٧٦

گـــەر بـــۆ غـــەمی عەشـــقی تـــۆ بـــەکار بێتـــەوه دڵ
ســـوار چاکـــە ســـوواری ئـــارەزوو بۆتـــەوه دڵ
گـــەر بـــێ و دڵ نـــەبێ ئـــەوین لـــە کـــوێ هەڵنیشـــێ
عەشـــقیش کـــە نـــەبێ بـــۆچی بـــەکـــار دێتـــەوه دڵ

١٧٧

چەنـــدم پـــێ وتـــی چـــاوت مـــەگێڕە ئـــەی دڵ
ئـــەم ڕێیـــە مـــەڕۆ فیتنـــە لـــە ڕێیـــە ئـــەی دڵ
ئێســـــتا کـــــە بوویـــــە عاشـــــق و ڕۆژت ئـــــاوا
گیانـــــت بـــــدە بـــــا جگـــــەر بســـــووتێ ئـــــەی دڵ

١٧٨

بـــوون، هـــەر جـــێ وجـــوودی هەیـــە ســـەیرە ئـــەی دڵ
ســـەر قاڵـــە بـــە خێـــر کـــاری بـــە خێـــرە ئـــەی دڵ
هـــەر شـــەڕ لـــە نـــەبوو دێـــت و نـــەبوو، غـــەیری بـــوون
پـــەس شـــەڕ هـــەموو هـــۆی هـــەوایی غـــەیرە ئـــەی دڵ

١٧٩

بـــۆ عـــەشـــق چیـــە چـــاتر لـــە ســـەبووری ئـــەی دڵ
گـــوێ ڕاگـــرە بـــا نەســـیحەتت کـــەم ئـــەی دڵ
هـــەر چەنـــدی کـــە یـــارت تیـــرە بارانـــت کـــا
تـــۆ کـــارێ نەکـــەی وەڕووی بێنـــی ئـــەی دڵ

١٨٠

دێوانـــەیی تـــۆ ڕووحـــی بـــە قیمـــەت مـــەنزڵ
شـــەیدایی غـــەمت عـــەقڵی بـــە تـــەنیا مـــەنزڵ
شـــەوگەردی جیهـــانی مەعریفـــەت یـــانی دڵ
بـــۆ بـــەحری غـــەمت قـــاچی لـــە قـــوڕ دەســـتی لـــەگڵ

١٨١

بابائـــادەم بـــە ئـــەم عـــەشـــقە بـــوو خـــاکی بـــووە گـــوڵ
ئاشـــووبی ئـــەوین بۆمـــە لـــە ئـــەو بـــوو حاصـــڵ
ســـەر نەشـــتەری عیشـــقیان لـــە ڕەگـــی ڕوحێـــک دا
قـــەترێک کـــە لـــە خـــوێن تکـــاوە هـــەر ئـــەو بـــووە دڵ

❋❋❋❋❋

# پیتی (م)

١٨٢

لەم تەکیە قەلەندەران کە بەنگیان پێدام
وەک وەی کە بڵێن لووتە بە سەنگیان لێدام
وتمان کە چ قەوماوە دەبەن ئابڕوومان
ڕیشم لە گرەو خستەوە چەنگیان پێدام

١٨٣

لـــەو مـــەنزڵی خـــۆم شـــوێن و مـــەکانی پێـــدام
بـــۆ بـــەزمی ئـــەوین جێگـــە وو بـــانی پێـــدام
دوا جـــار کـــە دڵـــی بـــردم و عەشـــقی پێـــدام
بـــــۆ دەشـــــت و بیابـــــانێ نیشـــــانی پێـــــدام

١٨٤

ئـــــەو ڕۆژە کـــــە جـــــامی ئاشـــــنایی پێـــــدام
دوایـــــی بـــــە ســـــتەم ژەهـــــری جـــــودایی پێـــــدام
دەمکـــووژێ دەفـــەرموێ ئەمـــە کوشـــتەی کێیـــە
دادم کـــــە دەویســـــت دادی وەفـــــایی پێـــــدام

١٨٥

دوێ شـــەو کـــە لـــە دوای مـــەنزڵی یـــارم دەگـــەڕام
دەیزانـــی کـــە بـــۆ چیمـــە لـــە کـــارم دەگـــەڕام
قوربـــانی خیلافـــی وەعدەکـــەی یـــارم بـــم
لـــە دوای ســـەری ئـــەو وەعـــدەیی پـــارم دەگـــەڕام

١٨٦

بـــۆ دیتنـــی ئـــەم یـــارە کـــە مەردانـــە گـــەڕام
لـــە وجـــوود و لـــە خـــۆم یەکســـەرە بێگانـــە کـــرام
زانســـتی نەویســـت یـــارم لـــە مـــن بێـــدەنگ بـــووم
کڕیـــار نـــەبوو بـــۆ عـــەقڵم و دێوانـــە، کـــرام

١٨٧

ڕۆژێـــک ســـەحەری لـــە دووی گـــوڵاوێ گـــەڕیام
وەک تڵتـــە گـــوڵێکم دی لـــە ئـــاوێ گریـــام
لـــێم پرســـی گوناهـــت چ بـــوو گریـــا فـــەرمووی
ڕازامـــەوە لـــەم باغـــە ســـەر ئـــاوێ نریـــام

١٨٨

هـــەر چەنـــدی بـــە ڕوخســـارم لـــە دوورت دابـــم
پـــێم خۆشـــە لـــە ژێـــر ڕەوشـــەنی نـــوورت دابـــم
بـــۆ عـــەشـــق و وەفـــای تـــۆ مـــن ئەگـــەر خـــاکیش بـــم
پێمخۆشـــە لـــە ژێـــر پێـــت و حـــزوورت دابـــم

١٨٩

چـــۆن دەکـــرێ بڵـــێم بـــە ســـەرگەڕی تـــۆ نـــابم
ئامـــــانجی تـــــوانجی گفتوگـــــۆی تـــــۆ نـــــابم
لێـــو بەســـتن و پـــێ بەســـتنم قەیـــدی ناکـــا
چـــۆن دەکـــرێ بڵـــێم لـــە ئـــارەزووی تـــۆ نـــابم

١٩٠

ئاســـانە ئەگـــەر بـــۆ تـــۆ لـــە ژێـــر خەنجـــەر بـــم
بـــۆ ژوانـــی تـــۆ پـــێم خۆشـــە ئەگـــەر بـــێ ســـەر بـــم
هاتوویـــــە دەڵـــــێن قـــــەرارە کـــــافر قڕکـــــەی
غـــازی گـــەر ئـــەتۆی چ خۆشـــە مـــن کافـــەر بـــم

١٩١

جـــار جـــارە لـــە عـــەشـــقی تـــۆ کـــە بێگانـــە دەبـــم
بـــــۆ خۆشـــــگوزەرانی دەمـــــێ هاوخانـــــە دەبـــــم
ئەوکاتـــــە کـــــە گوڵبـــــەدەن بـــــەلام ڕا دەبـــــڕێن
بامداوەتـــــەوە ســـــەیرە کـــــە دێوانـــــە دەبـــــم

## ١٩٢

هەرگیز نەبووە شکەستی کەس ئاواتم
ڕەنجاو نەبووە دڵێک لە من تا هاتم
مەمنوونم کە چاوم بە خەشی نابینێ
شادم کە زەویم عەشقە و غەم داهاتم

## ١٩٣

مێروولە کە چی هەڵدەگرێ جێ ڕەختم
سەر کایە درێژ بم دەچەمێ پێ تەختم
ئەم خۆرە بە یەک پاروو ئەگەر قووتی دەم
تاریک دەبێ ئەم سینەیە چەند بێ بەختم

## ١٩٤

هیلاکم لە ژێرباری هەڵەم پێ پەستم
گەر تۆ نەبی ئەی خوایە بە دەس کێ هەستم
گەر کردەوەکەم چەوت و پڕی زیزانە
خۆ تۆ کەرەمەت زۆرە کە بگری دەستم

١٩٥

ئەم عەشقە غەمی کۆنی بە سەر دا ڕشتم
پۆل وو شەرەری ئاگری پێ دا ڕشتم
خوێنی دڵ و ڕیشەی بەدەنی سووتاندم
ڕوندک هەموو سووتوو بوو لە پا دا ڕشتم

١٩٦

ئەم عەشقە کە هات غەمی بە سەردا ڕشتم
وەک کۆنە کەوان دەست بە عەسا ما پشتم
نەی پرسی کەسێک حاڵی دڵی شێواوم
چاوم نەبێ فرمێسکی لە پێدا ڕشتم

١٩٧

تەب هات و لە گەرمی ئاگرم دا کوشتم
چەن جاریش بە تەعویذ لە نزا دا کوشتم
ئەم جارە لە ناخی عەرەقم غەرقم کرد
وەک لەشکری فیرعەونی لە ئاو دا کوشتم

١٩٨

چەنــــد ســــاڵە کــــە بــــۆ تیــــری بــــەڵا ئامــــاجم
ئــــەی خۆزگــــە لــــە غــــەم قــــەت نــــەکرابا تــــاجم
گــــەرچی لــــە هــــەژاری و لــــە فــــەقر بــــێ وێنــــەم
بــــێ منــــەت لــــە هــــەموو کــــەس بــــە خــــودا ئاتــــاجم

١٩٩

عــــەشــــقت کــــە پێــــدام لــــە ئــــەهلی دەردت کــــردم
بێگانــــە لــــە خــــۆ بــــووم و لــــە عــــەقڵت کــــردم
بــــەڕماڵم لــــە ســــەر شــــان و لــــە مزگــــەوتێ بــــووم
مــــەی خــــۆرە وو ڕەنــــد و کووچەگــــەردت کــــردم

٢٠٠

بــــێ مــــاڵ و هــــەژار و بــــێ فلووســــت کــــردم
بــــێ خــــزم و کــــەس و ژن و مناڵــــت کــــردم
لــــەم حورمــــەت و ڕێــــزەی تــــۆ گــــەلێ مــــەمنوونم
ئــــاخۆ بــــە چ خزمــــەتێکی قــــەدرت گــــرتم

۲۰۱

ئـــەی دڵ وەرە تـــۆ بـــۆچی شـــەڵاڵت کـــردم

هـــەی لـــە خـــوێن شـــەڵاڵ بـــی کۆڵـــەوارت کـــردم

ئـــــاوارە لـــــە کـــــۆڵان و گەڕیـــــدەت کـــــردم

ئـــابڕووم کـــە نـــەما، بـــۆ لـــە ژیانـــت کـــردم

۲۰۲

ئێســـتا بـــە کـــەڕەم خـــاتری غـــەمگین کـــردم

موحتـــاجی بـــە هـــەر نـــانێکی جـــۆیین کـــردم

دیـــارە ئـــەوە لوتفێکـــە لەگـــەڵ مـــن دەیکـــا

تـــۆ بڵێـــی بـــە کێهـــا خزمـــەتی ســـەنگین کـــردم

۲۰۳

مـــن کێمـــە کـــەوا ســـادە دڵ و بـــێ گـــەردم

عونقـــــاڕەوش و کێـــــوی بڵنـــــد و مـــــەردم

دێوانەیـــەکی بـــێ خـــودی بیابـــانگـــەردم

دڵ پـــڕ لـــە ســـەفایێک و ســـەروپێ دەردم

٢٠٤

ئـــەی ســـۆزی ســـەحەر، بـــە مســـتەفا بـــێ ســـوێندم
بـــاران، بـــە عـــەلیی مورتـــەزا بـــێ ســـوێندم
ئـــەم خەڵکـــە هـــەموو فغـــان و ڕۆ ڕۆییێتـــی
دەریـــا، بـــە شـــەهیدی کەربـــەلا بـــێ ســـوێندم

٢٠٥

لـــەم تێکـــەڵی گیـــان و دڵ ئـــەتۆی مەقصـــوودم
بـــۆ مـــردن و ژیانـــەوەم ئـــەتۆی مەقصـــوودم
تـــۆ تـــۆیی، لـــە جێـــی خـــۆت و مـــنم ڕۆیشـــتوو
گـــەر مـــن، مـــن ئـــەڵێم لـــە مـــن ئـــەتۆی مەقصـــوودم

٢٠٦

گوفتـــاری جـــووانم هەیـــە، بـــێ کـــردارم
دەیڵێمـــــەوە بـــــێ کردەوەمـــــە، بێـــــزارم
پێویســـتە کـــە کـــردار و وتـــارم یـــەک بـــێ
ئاســـانم مەگـــەر چەندەیـــە؟ بـــێ دژوارم؟

٢٠٧

پێم وت سەنەمم، لالە ڕوخم، دڵدارم
پێم خۆشە لە خەو جارێ ببینم یارم
فەرمووی دەخەوی بێمەوو، ئێستا سەیرە
نیازت ئەوەیە لە خەو بکەی دیدارم

٢٠٨

چاوێکم هەیە هەر ئەوە بۆ دڵدارم
خۆشم کە دەوێ جێگەیە بۆ دڵدارم
جیاوازی لە نێو دیدە و دڵبەر ناکەم
چوون یارم لە ناوی ئەوە، ئەو دڵدارم

٢٠٩

جار وایە فرشتەم لە غەمی دڵدارم
جار وایە وەکوو ئاژەڵە خورد و خارم
جار وایە ڕقم، وەکوو دڕندە و کێوی
ئەی خوایە خەجاڵەت لە هەموو ڕەفتارم

## ٢١٠

تا دوورم لە دیداری ڕوخی نیگارم
سووتاو لە دەروونم لە میانی نارم
تا ڕۆژێ نەبینم لە پەنا دڵدارم
وەک دەنکی هەنار لە خوێن شەڵاڵ و زارم

## ٢١١

یارەب، بکەوە گرێ لە حاڵی زارم
ڕوحمێک، کە عەقڵ عاجزە بۆ هەرکارم
دەرگاهت نەبێ دەرگەیەکی شک نابەم
ئەم دەرگە لە ڕووم پێوە نەدەی، غەففارم

## ٢١٢

چەند ساڵە دڵم داوە بە غەم بۆ یارم
هەر خۆم بۆ غەم و دەردی بە دڵ کڕیارم
فەرمووتە نزێکی دڵ شکاوانم، من
داماوی هەڵەم شکاوە دڵ، دڵدارم

## ٢١٣

گـــەر کوشـــتنی مـــن دوو چـــاوی مەســـتی یـــارم
بێشــــک کـــــە سروشــــتی بوتپەرەســــتی یــــارم
بخـــوازێ لـــە مـــن دەبـــێ جـــووابم چـــی بـــێ
بـــۆ ئەزیـــەتی نـــازی پەنجـــەدەســـتی یـــارم

## ٢١٤

ســـاقی ئەگـــەرم مـــەی پـــێ نـــەدەی مـــن دەمـــرم
ئـــەم ســـاغەرە گـــەر لـــە دەســـت بخـــەی مـــن دەمـــرم
پەیمانـــەیی هـــەر کەســـێک کـــە پـــڕ بـــوو دەمـــرێ
پەیمانـــەیی مـــن خـــاڵی بکـــەی مـــن دەمـــرم

## ٢١٥

ئـــەی دڵبـــەری مـــن گـــەرچی دەبـــەی دڵ لـــە بـــەرم
تـــۆ دڵبـــەری مـــن چـــاتر لـــە ســـەد دڵ لـــە بـــەرم
ئێســـــتا نـــــە دڵـــــم مـــــاوە، نـــــە دڵبـــــەر مـــــاوە
دڵبـــەر نـــەبـــێ، دڵ، بۆچییـــە ســـەد دڵ لـــە بـــەرم

## ٢١٦

هـــەر تـــۆی لـــە ســـەفەر یـــار و ڕەفیقـــی ســـەفەرم
هـــەر تـــۆی لـــە حـــەزەر یـــار و ئەنیســـی حـــەزەرم
کـــاتێ لـــە ژیـــار کـــاتێ لـــە ســـەحـــڕا گـــوزەرم
کـــام نـــاوە لـــە غـــەیری تـــۆ بمێنـــی لـــە بـــەرم

## ٢١٧

پـــڕ ئـــاوە دووچـــاوم، پـــڕ لـــە ئـــاگر جگـــەرم
هـــەر بـــا لـــە دەســـم مـــاوە مـــەلی خاکـــە ســـەرم
ئـــەم عـــەشـــقە چ بـــوو هـــات و لـــە ئـــابڕووی کـــردم
چەنـــد ســـەیرە لـــە جیهـــانی غـــەمیش دەربـــەدەرم

## ٢١٨

ئـــەی خوایـــە تـــەوافی ماڵەکـــەت دەخـــوازم
مـــاچ کردنـــی ئاســـتانەکەت دەخـــوازم
بـــێ منـــەت لـــە خـــەڵک تووشـــەیی ئـــەم ڕێگایـــە
تـــەنیا هـــەر لـــە تـــۆ و خەزێنەکـــەت دەخـــوازم

٢١٩

نـــەک بـــاغ و نـــە بێســـتان نـــە چەمـــەن دەخـــوازم
نـــەک ســـەروو نـــە گـــوڵ نـــە یاســـەمەن دەخـــوازم
ویســـتم لـــە خـــودای گەورەیـــە ڕۆژێـــک بـــۆ مـــن
هـــەر مـــن بـــم و ئـــەو کـــەس بـــێ کـــە مـــن دەخـــوازم

٢٢٠

دەیزانـــی لـــە کـــوێ و لـــە کـــێ و چـــی دەخـــوازم
ژوانـــی تـــۆ منـــی بـــێ ســـەر و پـــێ دەخـــوازم
فـــــەریاد و فغـــــان و ناڵەکـــــەم دەتزانـــــی
یـــانی کـــە لـــەتۆ و ئـــەتۆ و لـــەتۆی دەخـــوازم

٢٢١

کۆڤـــانی تـــۆ لـــەو دڵـــەی حـــەزینم دەدزم
نـــاوی تـــۆ لـــە عـــەشـــق و لـــە ئـــەوینم دەدزم
هـــاوار نەکـــەم و قفـــڵ لـــە زارم بەســـتن
دەگـــریم و لـــە تـــاوان لـــە بـــرینم دەدزم

## ٢٢٢

بەر چاوو ونم لە گەنجی دەقیانووسم
سوو سوو دەکەم و لە شەمعی ناو فانووسم
ئێستا کە لە ناو چەمەن، وەکوو داری بی
لارانەوەمە لە پێشڕەوی مەعکووسم

## ٢٢٣

بێ باکی غەمم دڵ بە خودا دەفرۆشم
کاڵای منە دەروێشی سەفا دەفرۆشم
ڕزقم لە خەزێنەی کەرەمی ئەو بۆ دێ
وەک حەوتی (کهف) خۆ بە وەفا دەفرۆشم

## ٢٢٤

شەشدانگی جیهان بە لوتفی تۆ دەفرۆشم
من تۆم هەبێ هەرچی هەمە بۆ نەفرۆشم!
سێ تاری دڵم نە ژێری ماوە نە بەمی
تا کەنگێ قەلەندەر بم و بۆ نەفرۆشم!

٢٢٥

لۆمـــەم مەکـــە ئـــەی خواجـــە ئەگـــەر دەینۆشـــم
بـــــۆ عاشــــقی و بـــــادە دەبـــــێ تێکۆشــــم
هوشـــــیارم و دانیشــــتوو لــــە گــــەڵ ئـــــەغیارم
بێهـــۆش کـــە دەبـــم بـــە یـــادی ئـــەو دڵخۆشـــم

٢٢٦

لـــە نـــوێنی مـــەرگ، کـــاتێ کـــە مـــن بێهۆشـــم
ئەکوژێتــــــەوە شـــــەمعی تەمـــــەن و خامۆشــــم
حەشـــرم مەکـــە یـــارەب، لـــە پـــەنا بـــێ دەردێ
دوورم کــــە لــــەوان، چــــیم پــــێ دەکــــەی دڵخۆشـــم

٢٢٧

تـــا تـــۆ قـــەدەمت نایـــەوە ســـەر خـــاکی لەشـــم
دڵ هاتـــەوە خـــوێن گـــەڕاوە بـــەنـــد بـــەنـــدی لەشـــم
ڕووحـــــم لــــە زەمــــان، ناڵــــە و دەردی کێشـــا
هـــەر بـــەو قەدەمـــەت هاتـــەوە کاولاشـــی لەشـــم

٢٢٨

گـــــەر زولفـــــت لـــــە دۆزەخ بکەوێتـــــە چـــــەنگم
چیرۆکـــــە بەهەشـــــت بـــــا نەکەوێتـــــە چـــــەنگم
گـــەر بـــێ تـــۆ لـــە ئێســـتاوە بەهەشـــتم پـــێ دەن
ڕەنـــــگ زەردی لـــــە ئێســـــتاوە دەبێتـــــە ڕەنگـــــم

٢٢٩

یـــــــارەب، ئـــــــاوڕم لێـــــــدەوە ســـــــەرگەردانم
ئـــــالوودە بـــــە دەس نـــــەفس و هـــــەوەس دامـــــانم
کـــارێکی نەکـــەی شـــایەنی تۆڵـــەی مـــن بـــێ
داپۆشـــــە بـــــە لوتـــــف و کـــــەڕەمت تـــــاوانم

٢٣٠

ڕۆژێـــک بکـــەوی تـــۆ لـــە ســـەری مەیـــدانم
ئـــەو ڕۆژە بـــە دایـــم لـــە خـــومی چۆگـــانم
چەنـــد ڕەمـــزێ هـــەبوو کـــاتێ ئـــەوانت فـــەرموو
کوشـــــتیان مـــــن و منـــــیش غـــــولامی وانـــــم

٢٣١

زامێکـــــی بـــە ژانتـــــر لـــــە هــــەموو زامـــــانم
یــــەکێک لــــە ئـــەوان حەســـڕەتی بـــێ پایـــانم
داغتـــــر لــــە ئــــەوەش وەکــــوو گلێنــــەی چــــاوم
بــــۆم بوویـــــە بـــــە چــــاو، نایـــەوە بـــەر چــــاوانم

٢٣٢

لـــــەو ڕۆژەوە بردیـــــانم لـــــە ســــــەر دەرســــــانم
لــــەم حـــــوجرەوە بـــــۆ و حـــــوجرەوە ســـــەرگەردانم
ئێســـتا کـــە لـــە دوای ئـــەم هـــەموو هـــاتووچۆیـــە
وەک تفلـــــی دەبســـــتان لــــە ئــــەلف بـــێ یـــــانم

٢٣٣

ئــــەو ڕۆژە ئــــەوین هــــات و فڕانــــدی گیـــــانم
هـــــــاواریش بڵنـــــد بـــــوو لــــــە دەر و جیـــــرانم
ئێســـتاکە، کـــە ناڵـــەم کەمـــە گـــڕ گرتـــوومی
بـــێ دووکەڵــــە ئــــەم ئــــاگرە مـــــن حـــــەیرانم

٢٣٤

دەستێک نیە هەتا، لە سێوی دارت بچنم
قاچیش کە نەما بێم لە حەسارت بمرم
دیدەش کە نەما بێم و لە تاوت بگریم
ڕووشم نیە سەحەر لە خاکی ماڵت بسڕم

٢٣٥

بەختم نیە ئەگەر جارێ بە گیان بتبینم
یا لە ڕێڕەوێکی بە سەلام بتبینم
ژوانی تۆ بە هیچ جۆرێ وە دەستم نایە
هەر نێوت دەنووسم و بە نێو ئەتبینم

٢٣٦

گەر دەستی دوعا من لە خودا هەڵبێنم
ڕیشە و ڕەگی ئەم شاخە لە پا دەردێنم
ئێستا لە پەنای لوتف و سەفای مەعبوودم
بۆ سەبری جەمیل دەس لە خودا هەڵدێنم

## ٢٣٧

بـــا هــــەوڵێ بــــدەم دڵ لــــە گیــــان بســــتێنم
بــا خــۆم لــە پــەنای دڵبــەری گیــان بمــرێنم
وەک پـــــەردە لــــــە نێـــــوانی دڵ و دڵــــــدارم
بــا هەســتم و خــۆم لــە نێــو ئــەوان دەربێــنم

## ٢٣٨

ڕووی تۆیـــە دەبیـــنم، دەمـــێ چـــاو هەڵـــدێنم
لـــەش دێتـــە دڵـــم، مـــن کـــە دڵـــم دەدوێـــنم
نێـــوی تـــۆ نـــەبێ ولامـــی خـــەڵکی نـــادا
کاتێـــک، کـــە بـــە نـــاوێکی تـــری دەدوێـــنم

## ٢٣٩

یـــاڕەب، مـــن بـــە یـــەک بـــوونی تـــۆ ئیمـــان دێـــنم
ئیمـــان بـــە خـــودای عالـــەم و حـــەیوان دێـــنم
وشـــک و تـــەڕی دنیایـــە هـــەر ئـــەو دوەم لایـــە
دوو لێـــوی وشـــک، چـــاوی بـــە گریـــان دێـــنم

٢٤٠

بــۆ حورمــەتی نــاوی تــۆ ســەر و گیــان دێــنم
بــۆ عــەشــقت ئــەگــەر لازمــە جیهــان دێــنم
ڕۆژێــک کــە بــزانم ئــەوە تــۆم لــێ ڕازی
ئــەو ڕۆژە نــە هــەر گیــان، دڵ و ئیمــان دێــنم

٢٤١

لــەم بادەیــە بــۆ شــێخی بــە ڕەنگــێ دێــنم
ئیســلامی لــە ئــەتراقی فــەرەنگێ دێــنم
نــاقووس لــە کلیســایە وەدەنگــی دێــنم
تــەنیا مەبەســم تۆیــە بــە چــەنگی بێــنم

٢٤٢

یــادت دەکــەم گــەر شــاد و ئەگــەر غــەمگینم
نــاوت دەبــەم گــەر غایــب و گــەر بتبیــنم
بــەم یــادەوە خــووم گرتــووە ئــەی دڵــدارم
هــەر چەنــد دەڕووانــم هــەر ئــەتۆی دەیبیــنم

٢٤٣

داخـــم ئـــەوە ڕۆژێـــک دێ کـــە مـــن نـــامێنم
فرمێســـکی بـــە خـــوڕ دێتـــەوە کـــن دامێـــنم
ئـــەی خوایـــە لـــە بـــەر خـــاتری یـــارانی ڕێ
فـــەریـــام بگـــە زوو، درەنگـــە مـــن نـــامێنم

٢٤٤

دەردێکـــــم هەیـــــە و ســـــینەیەکی بـــــرژاوم
عـــەشـــقێکم هەیـــە و دیدەیـــەکی گریـــاوم
ئـــەم عـــەشـــقە چ عـــەشـــقێکە گـــڕی ســـووتێنەر
دەردیشـــــم بەژانـــــە لـــــە بـــــەرۆکی داوم

٢٤٥

یـــارەب، لـــە هـــەڵان و لـــە تـــەڵان ئـــاڵاوم
ئـــەی خوایـــە لـــە ژێربـــاری گوناهـــان مـــاوم
نوورێـــک بـــۆ دڵـــم لـــە عالـــەمی پـــاکی ڕا
بڕژێنـــە ســـەرم لـــە ژێـــر غـــەمان، تاســـاوم

## ٢٤٦

یارەب، لە دەسی نەفسی گڵاوم ماوم
یاڕەب، لە قسە و کاری خراپم ماوم
ڕوحمم پێ بکە ئێستە گەلێ موحتاجم
ئێستا بە دڵ و دەستی شکاوم ماوم

## ٢٤٧

لەم بازنەیەدا بەندەیەکی بێ ناوم
بە ئومێدی بزەم حەڵقە لە گوێدا ماوم
بملاوێنەوە جۆشم لە دڵدا ماوە
مەملاوێنەوە بەندەیەکی فەوتام

## ٢٤٨

بۆ خزمەتی تۆم ڕابرد هەموو عومری خۆم
هیوام ئەوە بوو ببیەوە هەم سۆزی خۆم
نەمزانی لە دوای ئەم هەموو ماندووبوونە
قەت ناگەم بە تۆ، ماندوو لە دەست شۆڕی خۆم

٢٤٩

غـــەمبارم لـــە دەرگـــەی تـــۆ لەگـــەڵ غـــەم نـــاڕۆم
تـــــا نەیکەمـــــە ئاهـــــەنگی دڵ و دەم نـــــاڕۆم
کارســـــازی کـــــەریم نەمـــــدی لـــــە دەرگـــــاهی تـــــۆ
دەســـــتێکی بـــــە تـــــاڵ بێتـــــەوە هـــــەر دەم نـــــاڕۆم

٢٥٠

دوێ شـــەو بـــوو لـــە کـــۆڵانی نـــەیارم دابـــووم
ســـەرقاڵی غـــەم و دەرد و لـــە کـــارم دابـــووم
شـــۆقار و ســـتەمکارە نـــەیار و دوژمـــن
دەیزانـــی لـــە دووی ڕێـــڕەوی یـــارم دابـــووم

٢٥١

بـــۆ ژوانـــی تـــۆ دوێنـــێ بـــوو لـــە گوڵشـــەن دابـــووم
ناڵـــەم بـــوو لـــە دووری تـــۆ لـــە شـــیوەن دابـــووم
پـــێم وت بـــە دوعـــا دوژمنـــی تـــۆ چـــاوی کـــوێر
ئـــەی خوایـــە مەگـــەر لـــە ڕێـــزی دوژمـــن دابـــووم

٢٥٢

لــەو دەرگــەیی تــۆ کەســێکی ســووتا مــن بــووم
یەخســیری لــە ســەرما و لــە گــەرما مــن بــووم
ئــەی دڵبــەری مــن، دوێنــێ لــە ســەربانت بــووم
فــەرمووت کــە دزە، دز نــەبوو ئــەو، نــا، مــن بــووم

٢٥٣

ئــاخ، چەنــدە لــە ڕێــی ناســینەوەم مانــدوو بــووم
بــۆ خوێنــدن هــەموو شــوێنەک و قــوژبن چــوو بــووم
ئێســــتا لــــە ســــەری پیریــــی و هەشــــتا ســــاڵی
وە دیــارە کــە چــوار بەنــدی تەمــەن خــەوتوو بــووم

٢٥٤

لــــەم بارەگەیــــە چیغــــی ئەمانــــەت نابــــەم
لــەو دەســتی غــەمت گیــان بــە ســەلامەت نابــەم
دەی لادە نقــــــاب و زووبــــــە ڕوو بنوێنــــــە
بــــەم حەســــڕەتەوە گیــــان بــــۆ قیامــــەت نابــــەم

٢٥٥

گـــەر بـــۆ تـــۆ نـــەبێ خوایـــە ســـەرم داناخـــەم
ســـەر تـــا لـــە تەنـــە، بـــێ غـــەمی تـــۆی بانـــادەم
گـەر تـۆ سـەری مـن بـێ سـەر و سـامانیش کـەی
چـــۆن بـــۆ تـــۆ ســـەر و گیـــان و دڵـــم ڕاناخـــەم

٢٥٦

ســـەرمایەیی غـــەم لـــە دەســـت بـــە ئاســـان نـــادەم
دەســـت هـــەڵگری تـــۆ نیمـــە هـــەتا گیـــان نـــادەم
دەردێکـــــــت وەکـــــــوو یـــــــادەوەری پێـــــــداوم
ئـــــەو دەردە بـــــە ملیـــــارێکی دەرمـــــان نـــــادەم

٢٥٧

گـــەر هەڵبـــدڕی لەشـــم لـــە ســـەر تـــا بـــە قـــەدەم
گیـــان دێتـــەوە بـــەم عـــەشـــقە لـــە تـــۆ ڕا لـــە عـــەدەم
گیـــــانێکم هەیـــــە بـــــە دەســـــتی تـــــۆ نەخشـــــاوە
پێـــت خۆشـــە بـــە شـــادیم بەرەســـەر یـــا نـــە بەغـــەم

## ٢٥٨

تـــا بـــردی لـــە ئـــەم ولاتـــە تەشـــریفی قـــەدەم
بـــۆ شـــەوقی دڵـــم شـــەوقی ئـــەوم کـــردە ڕەقـــەم
دێوانـــــە کـــــرام لـــــە کـــــاتی مـــــاڵاوایی
لـــەو دەوڵـــەتی دیـــدارە بـــوو مـــن بوومـــە ڕەقـــەم

## ٢٥٩

غـــەمبارم لـــە بـــەر تـــۆ لـــە دڵـــم دا ســـەد غـــەم
بـــێ گەوهـــەری ڕووت نامـــەوێ دنیـــا هـــەر دەم
ئـــەم ژینـــە دەمێکـــە لـــە دەســـی دامـــاوم
پـــێم خۆشـــە مـــەرگ بـــێ بـــە دوام دا هـــەر دەم

## ٢٦٠

ترســـم لـــە ڕەقیبـــە کـــە تـــەوافت ناکـــەم
تانـــەم لـــێ ئـــەدا بۆیـــە کـــە باســـت ناکـــەم
بەســـتوویە دەم و قـــاچم بـــە ناحـــەق ئـــەمما
دڵ تـــۆی دەوێ هـــەر بۆیـــە لـــە یـــادت ناکـــەم

## ٢٦١

بـــێ ســـەروی تـــۆ ئەندیشـــە لـــە قامـــەت ناکـــەم
هـــیچ کـــەس بـــە هـــەوای تـــۆوە مەلامـــەت ناکـــەم
لـــــەم هـــــەوڵی گەیشـــــتنم بـــــە تـــــۆ، ناوەســـــتم
بـــۆ ژوانـــی تـــۆ تۆبـــەی، تـــا قیامـــەت ناکـــەم

## ٢٦٢

ســـــەودایی غـــــەمت تـــــازە لـــــە دڵ دەر ناکـــــەم
بـــــەم دەردە دەبـــــێ تـــــازە دڵـــــم ڕیســـــوا کـــــەم
پـــێم خۆشـــە دڵـــم مـــەیلی یـــەکێکی تـــر کـــا
مـــن نەمهـــەوێ، دڵ دەیهـــەوێ خـــۆ شـــەڕ ناکـــەم

## ٢٦٣

بـــۆ ژوانـــی تـــۆ ئەندیشـــە لـــە مـــەرگـــم ناکـــەم
بـــێ ســـەبری لـــە دووری تـــۆ لـــە دەردم ناکـــەم
ناڵـــەم دێ لـــە مـــەحڕوومی لـــە دووری تـــۆ دا
ناشـــوکری لـــە بـــەر ناڵـــە وو دەردم ناکـــەم

## ٢٦٤

بۆ دەردی تۆ ئەندیشە لە دەرمان ناکەم
بۆ پەرچەمی تۆ فکرێ لە ئیمان ناکەم
گیانی من ئەگەر، گیان دەخوازی فەرموو
ئەندیشە لە گیان بۆ دڵی گیانان ناکەم

## ٢٦٥

یارەب، کەسی من تۆی و لە کەس ڕوو ناکەم
بۆ هەرکەسی کەس، کەس بە کەسی تۆ ناکەم
لوتف و کەرەمت ڕیشی منی چەرموو کرد
بەم موویی سپی بێجگە لە تۆ ڕوو ناکەم

## ٢٦٦

دڵ جێی تۆ نەبێ بە جارێ خوێناوی دەکەم
چاو بۆ تۆ نەبێ بە جارێ سیروانی دەکەم
بە ئۆمیدی ژوانی تۆیە گیانم ئەی نا
لەم لاشەیە دا بە جارێ کێو ماڵی دەکەم

## ٢٦٧

هەر یادت دەکەم بۆیە بە چاوی تەڕ دێم
لەم بادە بەهۆش نایەمەوە بێ سەر دێم
ڕۆژانی جودایی ئەمە کۆتایی هات
ڕێم پێ بدە دێم دێم بەڵام بێ سەر دێم

## ٢٦٨

تا چەندە لە دووی باوەڕ و ئیمان بگەڕێم
کاتی ئەوەیە کردەپەشیمان بگەڕێم
خاکم لە کلیسایەوە ئاوم لە شەڕاب
کافر تر لەوەم وەکوو موسڵمان بگەڕێم

## ٢٦٩

چەند ساڵە لە دوای مەنزڵی لەیلا دەگەڕێم
جارێ لە ژیار، جارێ لە سەحرا دەگەڕێم
ترسم لە هەموو کەس هەیە بێ هاوالّم
هەر بۆیە هەتا ئێستە بە تەنیا دەگەڕێم

٢٧٠

ویستم لە خودا بگەم بە جەنناتی نەعیم
زاهید بە عەمەل، منیش بە ئاواتی (عظیم)
من دەستی بە تاڵ دەڕۆم و ئەو دیاری بە دەست
لەم دووانە کێها ڕازی دەکا تەبعی کەریم

٢٧١

نێوان دوو بڕۆی یارم لە نوونی تا میم
لووت ئەلفە کە کێشراوە لە سەر سەفحەیی سیم
ئەو مانگە لە ئاسمانێ کە تۆ دەیبینی
کردوویە بە ئاماژەیی قامکی بە دوو نیم

٢٧٢

گەر بۆ تۆ ملم لە نووکی خەنجەر دانێم
بۆ عەشق و ئەوینی تۆ ئەگەر سەر دانێم
نامەردم ئەگەر لە دڵ ئەوینت لادەم
ئەم عیشقە هەمیشە وەکوو ئەفسەر دانێم

٢٧٣

زانســـــتت كـــــوا لـــــه ڕێـــزی ئینســـــانت نـــێم
دەســـت ئاوەڵـــە نیـــی، لـــە ڕێـــزی ســـەخیانت نـــێم
چاكـــە و ئـــەدەب و شـــەرم و حـــەیا هـــەر نیتـــە
تـــۆ خـــوا بـــە كێهـــا ســـەوزە لـــە ســـەر خوانـــت نـــێم

٢٧٤

مـــن لایقـــی عەشـــق و غـــەمی عـــەشـــقی تـــۆ نـــیم
ئـــەی داد كـــە شایســـتە بـــە عـــەشـــقی تـــۆ نـــیم
گـــەر ئـــاگری عـــەشـــقی تـــۆ بلێســـەی هەڵـــدا
ئـــەو كاتـــە دەبینـــی كـــە لـــە ڕێـــزی تـــۆ نـــیم

❋❋❋❋❋

# پیتی (ن)

٢٧٥

ئەی جوانتر لە هەر جوانی و لەعلت مەرجان
موو عەنبەر، سەدەف زارت و دوڕدانە دەدان
گنجی پێشانی شەپۆل و دوو کەشتی برۆ
گەرداوی بەڵا ژێرچەنە، چاوت تۆفان

٢٧٦

ناوەختــــە لــــە دڵ لادە وجـــوود و پـــەردان
زاخــــاوی بکــــە دڵ لــــە دەروون بــــۆ دەردان
بــایی بــە وتــن مەبــە بزانــە یــەکبوونی خــودا
یــەک دیتنــە نــەک یــەک وتنــە بــۆ مــەردان

٢٧٧

هەرچەنــــد گلــــەییم زۆرە لــــە ژانــــی دەردان
پیرانــە ســەریم خۆشــە لــە کووچــەی ڕەنــدان
دەور و هــــەڕەتی لاوی بــــە خــــۆڕایی چــــوو
مــەحکوومم لــە ئێســتاوە بــە کــۆت و زینــدان

٢٧٨

تــــا کــــەنگێ بکێشــــم منــــەتی نامــــەردان
بمکــــەن بــــە مقاشــــی دەڤــــەری ئــــاگردان
وا چاکــــە لــــە ئێســــتاوە بــــژیم مەردانــــە
ســـێ بـــەردە ئـــەنێم دەس فەلـــەکی ســـەرگەردان

٢٧٩

هێندە چ دەکەی لێرە لە دەوری مەیدان
ئێرە دەمی حەزیایە برینی فیلان
هەرکەس بێ دەبێ گیان و دڵی خۆی دانێ
بێ کار چ دەکا لێرە لە دەرکی ڕەحمان

٢٨٠

یارەبی عیلاجی بە پەلەی بیماران
ئەی ڕۆژی دەر و خاوەنی بەفر و باران
لێو وشکی بیابانی هەژارین ئێمە
بۆ دێمی ئومێدی مە بڕێژی باران

٢٨١

گەر تۆ نەبی یاریدەدەری گوڵناران
میوان چ دەبێ خونچە لە دڕک و خاران
هەر تۆی کە دەبی غەڕڕە بە دەریای کەڕەم
دووبارە دەخەمڵێنی چیا و کۆساران

٢٨٢

هەوڵێ بدە پەند وەرگرە یەک دوو، ڕۆژان
پێش تر لە مەرگ ڕێکەوە یەک دوو رۆژان
دنیا کە وەکوو پیرەژنە و بێ تامە
حەیفە بە دنوک پێوە بی بۆ دوو ڕۆژان

٢٨٣

هاوار و فغان دووبارە هەستا لە موغان
مەی خۆرە لە مەی نەماوە ناوی نە نیشان
بەم جۆرە لە ناو چوونە لە بەر چاوی جیهان
بۆ ئێمە ئەوان پێشقەدەم و پەندی زەمان

٢٨٤

هێزت کە هەیە ڕاکە بە دڵ باری دڵان
توانات کە هەیە بە دڵ ببە یاری دڵان
ئازاری دڵێک مەدە نەوەک تۆ دانێی
خێری دوو جیهان بە خاتر ئازاری دڵان

٢٨٥

بـــــۆ ژانـــــی دڵـــــم چوومـــــە تـــــەبیبێکی دڵان
فـــەرمووی: کــە لـــە حـــەق وێـــوە، بوەســـتێنی زمـــان
پـــێم وت : چ بخـــۆم غـــەزا ؟ وتـــی: خـــوێنی جگـــەر
وتـــم، پـــارێزم لـــە چـــی؟ وتـــی: باســـی جیهـــان

٢٨٦

ئـــــەی ڕووی تـــــۆ دلۆڤـــــانی و هیـــــوای گشـــــتمان
وەصـــڵی تـــۆ هـــەموو کـــاتێ تەمـــەننای گشـــتمان
بـــۆ گشـــتی کـــە چـــاتر بـــی لـــە مـــن وای لـــە مـــن
گـــەر بـــۆ هـــەموو وەک مـــن بـــی، ئیتـــر وای گشـــتمان

٢٨٧

ئـــــەی خـــــالقی عالـــــەم ڕێنمایـــــەک بۆمـــــان
بـــــۆ بەنـــــدەیی بێنـــــەوا نەوایـــــەک بۆمـــــان
کـــــاری منـــــی بێچـــــارە عەجـــــەب بەســـــراوە
ڕوحمێکـــــی بکـــــە گـــــرێ گوشـــــایەک بۆمـــــان

٢٨٨

یـــارەب، لـــە تـــەرەف تـــۆوە عیلاجێـــک بۆمـــان
بـــۆ نمروودەکـــان پێشـــوولە فیلێـــک بۆمـــان
فیرعـــەونی زەمـــان رەحمـــێ بـــە خـــەڵکی ناکـــا
مووســـا وو عەســـا وو چـــەمی نیلێـــک بۆمـــان

٢٨٩

یـــارەب ســـەبەبی ژیـــانی حـــەیوان بۆمـــان
لـــە خـــوانی کـــەرەم نیعمـــەتی ســـامان بۆمـــان
بـــۆ لێـــوی کـــزی ســـەوزە گیـــای نـــەو ڕەســـتە
لـــەم هـــەورە ڕەشـــە ڕێژنـــەیی بـــاران بۆمـــان

٢٩٠

زینـــدانی مـــنم لـــە کـــونجی زینـــدانی غـــەمان
گشـــت غـــەم لـــە جیهـــان هـــاودەمی غـــەم خانەکـــەمان
یـــا ڕەب بـــە کـــەرەم هێـــدی بکـــە دەردی دەدان
ئـــارامی بکـــە بـــە حورمـــەتی وەیســـی قـــران

---

وەیسی قەرەن لە یەمەن کاتێک گوێ بیس بوو کە ددانێکی پێغەمبەر(د خ) شەهید بووە لە تاوان تەواوی ددانەکانی خۆی دەرهێنا، قران: بە خاتری وەزنی شێعرە.

٢٩١

ژێـر پێـی تـۆ ئەگـەر ژانـی هـەبێ حـۆری جـوان
دەردی منـــە ئـــەو دێ نـــەوەکی دەردی ژان
ئـــەو دەردی منـــە ڕوحمـــی بـــە حـــاڵم دادێ
ئـــەو دێ کـــە بپاڕێتـــەوە نـــەک بـــۆ ڕەنجـــان

٢٩٢

تەسـبیح بـۆ مەلـەک، کـەیف وسـەفا بـۆ (رضـوان)
دۆزوخ بـــۆ ڕیاکـــارە، بەهەشـــت بـــۆ پاکـــان
دیبـــا بـــۆ جـــەم و قەیســـەر و هـــەم بـــۆ خاقـــان
بـــۆ ئێمـــە گیانـــان و گیـــان بـــۆ گیانـــان

٢٩٣

ئـەی ڕوومـەتی جـوانی تـۆ دڵئـارای هـەموان
وەی گـەوهـەری نـاو لێـوی تـۆ هیـوای هـەموان
گـەر بـۆ هـەموو چـاتر لـە منـی وای لـە مـن
گـەر بـۆ هـەموو وەک مـن بـی!! سـەڵای هـەموان

٢٩٤

ئـــەی چـــاوی تـــۆ ســـەرچاوەیی چـــاوی هـــەموان
بـــێ چـــاوی تـــۆ نـــوور نایەتـــە چـــاوی هـــەموان
ئـــەم خەڵکـــە هـــەموو چـــاوی بـــەرەو ڕووی تۆیـــە
ئـــەی چـــاوی تـــۆ ڕەوشـــەنگەری چـــاوی هـــەموان

٢٩٥

ڕوخســـاری تـــۆ ئـــەی تـــازە گـــوڵی ڕووح و ڕەوان
هێنـــــد ناســـــک و نـــــازدارە چ ڕۆژ و چ شـــــەوان
گـــەر بـــێ بـــە خـــەیاڵ گـــوزەر لـــە ســـەر چـــاوم کـــا
شـــــەمزاوی دەکـــــا ســـــێبەری هـــــەر دوو چـــــاوان

٢٩٦

ئـــــەی خـــــاوەنی ســـــیفاتی نـــــەرمتر لـــــە ڕەوان
هێـــزی تـــۆ نـــەبێ کـــەی دەگـــەڕێ خـــوێن لـــە ڕەگـــان
فـــەرمانت بـــە هـــەر کـــارێ کـــە ئـــەو لایـــق بـــێ
بـــەم جـــۆرە کـــە پێویســـتە بـــەدی دێ لـــە جیهـــان

## ٢٩٧

نالــــەم دێ لـــــە دەس زەنگـــــی و شـــەو دەنگـــــی وان
لــــــەو چـــــاوی ڕەش و دیمـــــەنی شــــــەوڕەنگی وان
سەرتاســــەری شـــــەو بـــــە بـــێ وچـــــان و وەســــتان
یەکســـــەر لـــــە ســـــەما دانــــە منـــیش چـــەنگی وان

## ٢٩٨

پەیـــدا لـــــە دەســـی قـــودڕەتی تـــۆ کـــاری جیهـــان
لوتــــف و کــــــەڕەمت ڕاگــــری ئــــارامی جیهـــــان
ئـــەی خوایـــە بـــە لوتــف و کـــەڕەمت تــا ســـەر بــێ
نیشــــانەیی مـــــۆری تـــــۆ لــــە ســـــەر بـــانی جیهــــان

## ٢٩٩

هۆشــــی مــــن نـــــە بێگانـــــە، نــــــە خزمــــان بردیـــان
ئــــــەم خونچـــــە دەمــــانی مـــــوو پەرێشــــان بردیـــان
ئێـــــژن کــــــە چ قـــــەوماوە دڵـــــت زوو پێـــــدان
وەڵڵاهـــــی بــــــە دەس مــــــن نــــەبوو هـــــاتن بردیـــــان

٣٠٠

ئەو یارە غەم و دەردی، بەڵا بۆ دڵ و گیان
وەک مشکی بەبا دەدا غەمی خەرمەنی گیان
لە دوای دەگەڕێم دەربەدەر و ئاوارە
ئەو لە نێوانی دڵ و دەس لە مل و وێڵە گیان

٣٠١

گیانێک و زمانێک و زمان دوژمنی گیان
گیانت کە دەوێ لازمە ڕابگری زمان
پەندێکە هەموو کاتێ دەبێ بیزانی
سەرپووش و گەڵادارە زمان بادی خەزان

٣٠٢

هۆزێکی کە حەق بێژییە گفتی دەمیان
هاودەم بە لەگەڵیان و بچۆ خزمەتیان
هەرکەس لە زەمان ڕەنج و عەزابی کێشا
تایبەت مەندی تریاکی هەیە سوحبەتیان

٣٠٣

چـــوون حـــەق بـــە درێژایـــی هـــەموو شـــت بـــوو بـــەیان
نیشــــــانت درا عالــــــەمی پــــــڕ ســــــوود و زیــــــان
قـــەت نـــەبووە لـــە عالـــەم کـــە خەتایـــەک ڕوودا
فـــەرمانی ئـــەزەل هـــەر بـــووە کـــاتی خـــۆ عـــەیان

٣٠٤

پـــێم وت بـــە گـــوڵی خونچـــە دەمـــی سـووری بـــەیان
مەیشــــارەوە ئــــەم ڕوومەتــــە ســــوورە لــــە میــــان
دایـــە ژێـــر خەنـــدە کـــە مـــن بـــە عەکســـی جوانـــان
بـــێ پـــەردە ونـــم، هەمیشـــە ژێـــر پـــەردە عـــەیان

٣٠٥

زانســــت و عەمــــەل ئەگــــەر لــــە ڕێزێــــک دابــــن
خۆشـــی دوو جیهـــانی مـــە وەکـــوو یـــەک نـــابن
قـــەت بـــایی مەبـــە بـــە خوێندنـــەوەی پـــەڕتووکێک
لـــەو ڕۆژە بترســـێ کـــە وەکـــوو یـــەک نـــابن

## ٣٠٦

خـــاوەن دەســـەڵات مەســـتی تـــەماع و پەســـتن
مووســـا کـــوژ و فیرعـــەونی لـــەعین و پەســـتن
عەهـــــد و پـــــەیمانی خودایـــــان کەشـــــکە
پـــێش حـــەق دەگـــرن چونکـــە بـــە خـــۆ ناوەســـتن

## ٣٠٧

پردێکـــی لـــە ســـەر بـــەحری ســـپی هەڵبەســـتن
ڕێـــی گەردشـــی ئەســـتێرە خشـــووکی بەســـتن
زار و دەمـــی مـــار و دەمـــی ژووژک بەســـتن
ئاســـانترە لام، لـــە زاری خـــەڵکی بەســـتن

## ٣٠٨

مـــەردانی خـــودا لـــە خـــۆڵ و خـــاکێکی تـــرن
زۆر بـــەرزە فـــڕن لـــە ئاشـــیانێکی تـــرن
پێـــت ســـەیر نـــەبێ بـــە ڕەنـــگ و ڕوو دامـــاون
بـــێ منـــەت لـــە ژیـــانن لـــە جیهـــانێکی تـــرن

۳۰۹

گــــەر دوژمنـــــی مــــەردان لــــە پــــەنا ڕا بمــــرن
لــــەم بــــەر قــــەد و گۆڕانــــە لــــە خــــەو دا بــــڕزن
چــــوار پــــا بــــە مەســــەل بچێتــــە نــــاو دەریــــاوە
دەریــــا هــــەر وەکــــوو خۆیــــەتی ســــەگ بــــا بمــــرن

۳۱۰

ئــــەم خــــەڵکــــە ســــەدان دەســــتەوو جــــوورا جــــوورن
جــــار وایــــە ئــــەلف جــــارێکی خــــوار و نــــوونن
بــــۆ خزمــــەتی دەرگــــاهی خــــودا بــــێ وازن
ســــوورماوە ســــەرم مەســــتن و یــــا مــــەجنوونن

۳۱۱

عاشــــق مــــن و دێوانــــە مــــن و شــــەیدا مــــن
بــــێ ئــــابڕو مــــن و بــــێ لــــەزەت و ڕیســــوا مــــن
کــــافر مــــن و بــــت پەرەســــت مــــن و تەرســــا مــــن
ئەفســــانە مــــن و لــــەوەش خرابتــــر کــــوا؟ مــــن!

۳۱۲

بۆ مەتڵەبی عەشقی تۆ قەوی دەستم من
خاوەن نەزەر و بە ناوی تۆ مەستم من
هەڵ نایەم لەبەر ئاگری عەشقت مەردم
نەک هەر «بووسەعید» خاوەنی هەڵوێستم من

۳۱۳

ڕەنجاوم لە دڵ گەرچی کەم ئازارم من
بێ یار و دیار گەرچی وەفادارم من
هەر کەس بە وەفا و سەبرەوە، کارم بۆ کرد
سبحان الله، لە چاوی ئەو خوارم من

۳۱٤

کوا بەختم لەگەڵ یارم کە تێک ئاڵێم من
سەبریش کە نەما لە عەشقی ڕابوێرم من
دەستێک کە قەزا دوورخەمەوە هەر نیمە
قاچیش کە نەما لێرەوە ڕاگوێزم من

٣١٥

دووبـــارە ئەمـــە بـــۆنێ لـــە مـــەی دێ بـــۆ مـــن
ئـــاوازی نـــەی و دەنگـــی دەفـــەی دێ بـــۆ مـــن
نـــاخی دڵـــی مـــن ڕازی خـــودایی هـــەر دەم
حـــەققم پـــێ ئـــەڵێ بـــەڵام لـــە نـــەی دێ بـــۆ مـــن

٣١٦

ئـــەی گێـــژ و سەراســـیمە لـــە بـــەحری تـــۆ مـــن
ئـــەی ون بـــوو لـــە تـــۆ، لـــە مـــن لـــە یـــادی تـــۆ مـــن
قـــەت ناگـــەم بـــە تـــۆ لەبـــەر ســـیفات و زاتـــت
مـــن دیـــارم لـــە تـــۆ هـــەر تـــۆ نـــەدیوی بـــۆ مـــن

٣١٧

ئـــەی ئـــەو کەســـی پێـــت عـــەیبـــە ببینـــی تـــۆ مـــن
ڕوحمـــی تـــۆ لـــە جێـــی ڕووح و ڕەوانـــە بـــۆ مـــن
بـــەو دەســـتە نیگارینـــە لـــە گـــوێم ڕاکێشـــی
خـــوێنی دەهـــەزار کوشـــتە ئەخـــەم لـــە ســـتۆ مـــن

## ٣١٨

زانستی ئەزەل نە تۆ لەوت زانی نە من
وەک کوێرەگرێ نە تۆ لە ئەو حاڵی نە من
ئێستا کە لە پشت پەردەیە باسی من و تۆ
پەردەش کە نەما نە تۆ لە جێ ماوی نە من

## ٣١٩

ئەی خالقی زول جەلال و ئەی ڕەببی من
تا چەندە بڕۆم دەربەدەر و بێ جێ من
یا دەرکی ئومێدم لە سەرم والا کە
یا قفڵی موهیمماتم بدە دەستی من

## ٣٢٠

ڕازێک کە بە شەو دەیخەیە سەر یادی من
هەر چەندە دەکەم نایەتە سەر زاری من
هەر بۆیە، بە ڕۆژ لارە مل و شەرمێون
فرمێسکی وشک نابێتەوە چاوی من

### ٣٢١

دابـــڕن لـــە مـــن نیگـــاری هاومـــاڵی مـــن
بـــدڕێنن لـــە مـــن لیباســـی ئەشـــڕافی مـــن
مـــەجنوون بـــۆ نەســـیحەت لـــە دڵـــم پەیـــدا بـــوو
ســـەیری کـــە بـــە کـــوێ گەیشـــتووە کـــاری مـــن

### ٣٢٢

ئـــەی زولفـــی بـــڵاوی تـــۆ بـــەڵا بـــۆ دڵـــی مـــن
وەی لـــەعلی دوو لێـــوی تـــۆ ســـەفا بـــۆ دڵـــی مـــن
مـــن نـــادەم بـــە کـــەس دڵـــم بـــە خـــاتر، دڵـــی تـــۆ
تـــۆش مەیـــدە بـــە کـــەس بیکـــە چـــرا بـــۆ دڵـــی مـــن

### ٣٢٣

ئـــەی یـــادی تـــۆ ئافـــەت و ســـکوونی دڵـــی مـــن
دووری مـــن لـــە تـــۆ ڕژانـــدی خـــوێنی دڵـــی مـــن
مـــــن دەزانـــــم و دڵ، لـــــە فیراقـــــت چـــــۆنم
کـــێ بـــا خەبـــەرە لـــە نـــاو دەروونـــی دڵـــی مـــن

٣٢٤

چاوم بوو بە ڕێنوێنی ئەوینی دڵی من
ئەو کردی تەژی لە غەم دەروونی دڵی من
هاوارە ئەگەر دڵم بمێنێ ڕۆژێک
لەو چاوە دەسێنێتەوە خوێنی دڵی من

٣٢٥

گڕ دای لە دڵ و دەروونی سووتاوی من
خارج بوو لە ئەندازە تەب و تاوی من
ناچارم ئەگەر جارێ قسەی چەوتیش کەم
مەعلووم بێ مەگەر حاڵەتی شێواوی من

٣٢٦

ئەی ڕەوشەن لە دیداری ڕوخت چاوی من
ڕوحمی تۆ سەبەب ڕەوشنی ڕوخساری من
شەمعی ڕوخی تۆ خۆری لە بەر داگیرسا
وەک خوێن لە ڕەگان ڕەوان بووە کاری من

327

ئەی عەشقی تۆ سەرمایە لەبەر چاوی من
عەشقی تۆ گڕی داوە لە خەرمانی من
دەمزانی کە من قەت بە ژوانت ناگەم
ئەوکاتە کە دیم شکاوە هەنگاوی من

328

سوڵتان، کە دەڵێ: لە کوێیە گەنجینەی من
سۆفیش کە دەڵێ، لە کوێیە پەشمینەی من
ئەی داد، لە عەشق و غەمی دێرینی من
سوتمان و گڕ و ئاگرە نێو سینەی من

329

ئەو پۆڕە فرشتەی لە سەرای سوڵتانن
وەک ئێمە لە کاران و لە کار حەیرانن
هەوساری جیهان گشتی لە دەست تۆ دایە
نەک ئێمە ئەوانیش چ لە هیچ نازانن

## ٣٣٠

گـــەر دوو کەســـی نـــاو کۆمـــەڵێ ســـەرگەردانن
نـــابن بـــە عـــەیب چـــوون نـــە لـــە ڕێـــی مـــەردانن
تەقلیـــدی مـــــەلاو شـــێخی بـــە زاهیـــر زانـــا
ڕێ ون کـــــەرە وەک شـــینە پـــەڕۆی سەرشـــانن

## ٣٣١

مـــەردان لـــە بـــەیان دێـــن و لـــە ســـەر مەیـــدانن
دەگـــرین بـــە دوعـــا مانـــدوو لـــە ســـەر ســـوژدانن
هەوســـاری هـــەوەس تـــا لـــە دەســـی نەفســـن بـــێ
لێـــو خونچـــە دەمـــان نایەنـــە بـــەر فـــەرمانن

## ٣٣٢

خـــۆر و فەلـــەک و ئـــەوەی لـــە ئاســـمانانن
فەرمانبـــەرن بـــەم حاڵـــەوە ســـەرگەردانن
ئـــەڕواحی بـــەڕێزیش کـــە لـــە ژێـــر فـــەرمانن
بـــۆ تـــۆ دەگـــەڕێن و چ لـــە هـــیچ نـــازانن

## ٣٣٣

ئەم خەڵکە هەواڵێک لە دەروونم بێنن
پێت وایە وەکوو ئادەمی نێوم بێنن؟
گەر بێم و دەروون لە ڕوو بەڕوو واڵا کەم
هەڵدێن لە بەرم دێنەوە بمسووتێنن

## ٣٣٤

سەوزایی بەهەشت و نەوبەهارت دێنن
لێوت بۆ بەهەشت بە یادگارت دێنن
کوردان هەموو فاڵی ڕۆژگارت دێنن
لەو چینەوە دێن نەخش و نیگارت دێنن

## ٣٣٥

گەر چاکە بکەی بە چاکە ناوت دێنن
زوڵمێ کە بکەی ڕۆژێ بە دارت دێنن
چاوی عەقڵت بکەوە و بیبینە
لەم دوانە بە کام کردەوە ناوت بێنن؟

## ٣٣٦

ڕۆژێک دێ بەرەو گۆڕی نەمانم دێنن
کۆتایی بە دەرد و غەم و ژانم دێنن
ون بوومە لە خۆم زەڕڕە لە خۆری تۆمە
وەک زەڕڕە لە خۆر ناوو نیشانم دێنن

## ٣٣٧

ئێستا، کە خەڵک، بە چاکە ناوم دێنن
بۆ سۆ لە دەروون و لە هەناوم دێنن
گەر بێم و دەروون لە ڕوو بەڕوو بنوێنم
سەگ مەرگم دەکەن خوێن لە دوو چاوم دێنن

## ٣٣٨

هێندێک لە خەیاڵ و لە غڕووڕ دا ماون
هێندێکی لە تاو خونچەدەمان فەوتاون
زۆرێک لە گومان کەمێک لە ڕاستی ماون
دوور بوونە لە یەزدان و لە دوور داماون

٣٣٩

ئـــــازاری دڵ و ژانـــــی ژیـــــان و گـــــەردوون
دوو دیـــــدە لـــــە گریـــــانی شـــــەوو ڕۆژی ڕوون
ســــــووکیلە لەشـــــێک و ئـــــاگری خـــــەرمانم
ســـەد خۆزگـــە نـــەهاتبام نـــە دیبـــامی بـــوون

٣٤٠

مـــــەردانی خـــــودا دڵان بـــــە دنیـــــا نـــــادەن
دەمیـــان لـــە شـــەڕ و فیتنـــە وو هـــەڵڵا نـــادەن
لـــەم بازنەیـــە دا ئـــەهلی وەفـــا پـــەرگارن
ســـەر دادەخـــەن و لـــە خـــەتتی تـــۆ لانـــادەن

٣٤١

لـــەو مەدرەســـە ئەســـبابی بـــەدەڵمـــان پێـــدەن
لـــەم مەیکـــەدە لـــەززەتی ئـــەزەلمان پێـــدەن
ئـــــەم شـــــوێنە وڵاتـــــی ئارەزوومەندانـــــە
ســـــەرمایەیی ئیمـــــانی تەســـــەلمان پێـــــدەن

## ٣٤٢

لەو دەرگەیی تۆ گیانی بە جۆییێکی ئەدەن
کاروانێ، نە هەر گیانێ بەجۆییێکی ئەدەن
بۆ ژوانی تۆ جیهان هەموو نرخی جۆیەک
جینسی مە هەمووی بە نیوە جۆییێکی ئەدەن

## ٣٤٣

شەو هەستەوە عاشق بە شەوان داوا کەن
دێن دڵ دەدەن و هەر لە شەوان سەودا کەن
شەو هەرچی دەر و پەنجەرەیە دادەخرێ
دەرگاهی خودا قەت لە شەوان دا ناخەن

## ٣٤٤

مەردانی خودا مەیل بە مەستی ناکەن
خۆیان کە دەبینن خۆپەرەستی ناکەن
ئەم دەستە لە یادی حەق و مەستی یارن
خمخانە بە جێ دێڵن و مەستی ناکەن

٣٤٥

گـــەر بـــانی هـــەوا ببێتـــە ئاوێنـــەیی چـــین
ڕەق تـر بـێ لـە پـۆڵا وو لـە سـەنگ ڕووی زەمـین
ڕزقـــی تـــۆ هـــەتا مـــاوی لـــە کـــورتی نـــادا
ڕۆژی بـــەرێ نووســـیویە بەدیهێنـــەری ژیـــن

٣٤٦

ڕۆژێکـــی هـــەڵاتم لـــە غـــەمی لـــەش زێـــڕین
ویســـتم کـــە دڵـــم لـــە غـــەم ڕەهـــا بـــێ مســـکیین
عـەشـقی تـۆ کـە هـات لـە نیـوە ڕێـی پـێ گـرتم
زنجیـــری وەکـــوو جـــانی لـــە ئەســـتۆ کـــردین

٣٤٧

لـەم جـەور و جـەفای تـۆ فەلـەکی ئاوینـە شـین
لـــەم گەردشـــی ئـــەم کـــەوانی خاشـــاک نشـــین
لـــەم چـــاوە ڕوخـــێکم هەیـــە خـــوێنی لـــێ دێ
لـــەم ســـینە دڵـــێکم هەیـــە پـــڕ ناڵـــە و شـــین

٣٤٨

بــێ ســـوودە هـــەتا کـــەنگێ لـــە مـــاڵ دانیشـــین
چـــارەن ئـــەوە، داوێنـــت لـــە داوێـــن بەســـتین
ئـــەو ڕۆژە کـــە دەســـتی مـــە لـــە داوێنـــت دا
چـــۆن دەکـــرێ لـــە داوێنـــی تـــۆ دەس هـــەڵبگریین

٣٤٩

گیانـــە مـــن و تـــۆ هـــەر دوو ســـەری خـــەتتێکین
لـــک گـــەرچی دووە بـــەڵام لـــە پەیوەنـــدێکین
ئێســـتاکە لـــە ســـەر هێـــڵ و مـــەداری جغـــزین
دوایـــی هەســـت ئەکـــەی، لـــە مـــاکی پەیوەنـــدێکین

٣٥٠

یـــارەببی لـــە بـــەر خـــاتری فـــەخری (ثَقَلَـــــین)
ئـــەی خوایـــە لـــە بـــەر ڕێـــزی شـــەهیدانی حونـــەین
تـــاوانم بـــە دوولەتکـــە، لـــە ڕۆژی قیامـــەت
نیـــوەی بـــە حەســـەن ببەخشـــە نیـــوەی بـــە حوســـەین

٣٥١

گا زاهیدی سەد دانە بە دەستم پێ دەڵێن
گا ڕەند و خەراباتی و مەستم پێ دەڵێن
ئێستا کە لە پشت پەردەیە کار و بارم
ڕۆژێک بدرێ پەردە لە ڕووم چم پێ دەڵێن

٣٥٢

بۆ بەزمی تۆ، بوتخانە پەرەستم پێدەڵێن
جار وایە خەڕاباتی و مەستم پێدەڵێن
بێباکی خەڵک، سازم و مەستی یارم
ئیرۆیی دەبەن هەر بە مەبەستم پێدەڵێن

٣٥٣

ئەی لە هەر کات و زەمان، دووری لە شەین
بێ وێنە لە کردار و عەمەل دووری لە مەین
عەقڵە کە دەڵێ هەموو جودا، تۆ تەنیا
زاتی تۆ سیفاتی تۆ بە زانست و بە عەین

### ٣٥٤

ناچـــارین دەبـــێ ڕوومـــان لـــە یـــەک ڕێگـــا کـــەین
ئـــەم ڕایـــەخی عاشـــقی دەبـــێ چەنـــد لا کـــەین
چاومـــان نـــە لـــە تاعـــەت و لـــە چاکـــەی خۆمـــان
هـــەر لـــوتفی خـــودا گـــەورە لـــە چـــاوی دا کـــەین

### ٣٥٥

داخـــم ئـــەوە فکرێکـــی لـــە مـــردن ناکـــەین
پۆشـــاکی هـــەژارێکی بـــە کـــردن نـــادەین
هـــەر فیـــز و هەوایـــە بـــە دڵـــی دەفرۆشـــین
شـــەرمێ لـــە خوداوەنـــد و لـــە خۆشـــن ناکـــەین

### ٣٥٦

بـــۆ بەنـــدەگی تـــۆ، خـــودایی ســـوبحان، ئێمـــەین
بەرجەســـتە لـــە نێـــو جغـــز و لـــە مەیـــدان ئێمـــەین
پـــەیمانی (لِیَعبُـــــــــدُونَ) ئـــەنجامی دەیـــن
ئەوکاتـــە جیهـــان نمـــایی جیهـــان ئێمـــەین

### ٣٥٧

پـــڕ ناڵـــە لـــە هـــەیوانی گـــەدایان ئێمـــەین
بـــەدناوی لـــە نـــاو ڕیـــزی گـــەدایان ئێمـــەین
لـــە خـــراپ و خـــراپ تـــران کـــە تـــۆ دەیبینـــی
گـــەر ســـەیری بکـــەی لـــە بـــێ حـــەیایان ئێمـــەین

### ٣٥٨

گـــەرچی لەمـــەی و لـــە بـــادە خـــۆ دەبـــوێریین
بـــەم فیـــز و هەوایـــە بـــە دەروون نـــاوێریین
بـــۆ کـــاری ستەم کـــاری بـــە بـــێ مـــەی مەســـتیین
هـــەر بۆیـــە لـــە دنیـــا و لـــەدین بـــێ خێـــریین

### ٣٥٩

ناڵـــەم دێ لـــە دەســـت تـــۆ فەلـــەکی ئاوێنـــە شـــیین
لـــەم جـــەور و جـــەفای تۆیـــە دڵـــم بۆتـــە بـــریین
ڕۆژێ بـــە هـــەزار غـــەم هـــەتا شـــەو دادێ
دووبـــارە وەخـــۆ دێیـــەوە دەیگـــۆڕی ســـەریین

# پیتی (و)

٣٦٠

کێشاتەوە هەوساری سەبووری لە هەناو
تا قووڵ بوو وەکوو ڕکێف حەلقەیی چاو
چۆن تازە لە حوکمی تۆ سەرم هەڵدەبڕم
تا دەستم کەوێ دەوڵەتی پابووسی هەناو

## ٣٦١

ئـــەو دەم خەبـــەری ئـــەوین لـــە گـــوێی مـــن دابـــوو
گیـــان و دڵ و دیـــدە، نـــە لـــە دەســـت مـــن دابـــوو
پێموابـــوو کـــە مـــەعشـــووقە وو عاشـــق دوونـــە
دووبینـــی لـــە نـــاو گیـــان و دڵـــی مـــن دابـــوو

## ٣٦٢

لـــەو ڕۆژەوە عاشـــقی لـــە دڵ پەیـــدا بـــوو
دڵبـــەر گـــڕی ســـووتانی لـــە عاشـــق دابـــوو
هـــەر ئـــەو بـــوو کـــە مـــەیلی بـــە کـــەبابی دڵ بـــوو
پەروانـــە لـــە نـــاو چـــوو کـــە شـــەمع پەیـــدا بـــوو

## ٣٦٣

ڕۆژێـــک لـــە نـــەکاو دیـــم کـــە ئـــەوین پەیـــدا بـــوو
پێموابـــوو دەگـــەم بـــە مـــەنزڵی لـــەیلا زوو
دوومـــەنزڵ کـــە ڕۆیشـــتم و مـــەوجم بینـــی
قـــاچم لـــە هـــەوا فڕانـــدمی دەریـــا زوو

٣٦٤

ئــــەم گـــاورە ســـتەمکارە لـــە کـــویَ پەیـــدا بـــوو
ئـــەم وێنـــە لـــە گۆڕخانـــە لـــە کـــویَ پەیـدا بـــوو
ئـــــەم خـــــۆرە چیـــــە پـــــەردە بـــــە ڕووم دادێنـــــیَ
ئـــەم هـــەورە ڕەش و لێڵـــە لـــە کـــویَ پەیـــدا بـــوو

٣٦٥

لـــەو ناڵـــە لـــە نـــوێنی غـــەمی دوێـــنم دابـــوو
غـــەم مۆتەکـــە بـــوو لـــە جـــەرگ و نـــاخم دابـــوو
یـــارانم هـــەموو شـــاهیدی حـــاڵی مـــن بـــوون
یارێـــک کـــە بـــە ئـــەو زانـــی لـــە نێـــو گـــوێم دابـــوو

٣٦٦

تـــا ئـــاگری ئـــەم عـــەشـــقە لـــە دڵ مـــن دابـــوو
هۆشـــم نـــەبـــوو عـــەقڵم نـــە لەگـــەڵ مـــن دابـــوو
تـــا هاتـــە بـــەرم ســـیَ وەڕەقـــی عـــەشـــقی تـــۆ
ســـیَ ســـەد وەڕەقـــم چـــوو کـــە لـــە دەس مـــن دابـــوو

٣٦٧

لــەم لــوتفی تــۆ کــام بەندەیــە بــێ هیــوا بــوو
لــوتفی تــۆ بــە یــەکجاری لــە ڕوو پەیــدا بــوو
ئــەو ڕۆژە کــە ڕوحمــی تــۆ لــە ســەر مــن بــاری
ســـــەودایەکی وا، بۆمـــــە ســـــەدان ســـــەودا بـــــوو

٣٦٨

گــەر تیــر بــێ وەکــوو ئــەوەی بپێکــێ یــەک مــوو
مەردانـــــە بوەســـــتە ڕاگـــــرە ڕوومـــــەت و ڕوو
هـــــای مـــــەردان ، جـــــوانمێران هـــــای
ئامـــــان ئامـــــان، لـــــە ئـــــەو مەســـــووڕێنن ڕوو

٣٦٩

مـــن شـــێری ژیـــان بـــووم و پڵنـــگ ڕاوم بـــوو
نێچیـــر هـــەموو دەم حـــازری بـــەر چـــاوم بـــوو
عـــەشـــقی تـــۆ کـــە هـــات باوەشـــی پێـــداگرتم
ڕێـــوی شـــەلـــە ئامـــادە لـــە بـــۆ ڕاوم بـــوو

٣٧٠

عـــەشـــقی تـــۆ بـــەڵا، بـــۆ دڵ و گیـــانی مـــن بـــوو
بردوویـــە لەگـــەڵ خـــۆ، دەڵـــێ خزمـــی مـــن بـــوو
ویســـتم ســـەفەرێکی لـــە غـــەمی تـــۆ هـــەڵبێم
هـــەر جێیـــە هـــەڵاتم، ئـــەو لـــە پێشـــی مـــن بـــوو

٣٧١

ئـــەو کاتـــە کـــە ئـــەم ســـتێر و ئاســـمانە نـــەبوو
ئـــەم ئـــاو و هـــەواو و ئـــاگر و خاکـــە نـــەبوو
ئەســـڕاڕی یەکایـــەتی لـــە ســـەر لێـــوم بـــوو
ئـــەم قالـــب و ئـــەم نـــەواو و ئیدراکـــە نـــەبوو

٣٧٢

دوێ شـــەو لـــە خـــەوم جـــەماڵی یـــارم دی بـــوو
ویســـتم کـــە گـــوڵێ بچـــنم و کـــارم پـــێ بـــوو
ئـــاوازی ســـەحەر خـــەوی لـــە چـــاوم هـــەڵگرت
ئـــەی خۆزگـــە لـــە خـــەو دەمـــام و یـــارم دی بـــوو

## ۳۷۳

دوێنـــێم بـــە کـــەیف بـــوو کـــە بـــێ دڵ تـــەنگی بـــوو
ســـەیرم هـــەموو بـــۆ عالـــەمی یـــەک ڕەنگـــی بـــوو
ئاشـــتی لـــە هـــەموو لایـــەک و ئـــازادی بـــوو
مـــن بـــووم و ســـکووتی مـــن و بـــێ دەنگـــی بـــوو

## ۳۷٤

لـــەم شـــارە کەنیشـــتێک و کلێســـەی لـــێ بـــوو
باســـی تـــۆم لـــە نێـــو باســـی ئـــەوان گـــوێ لـــێ بـــوو
بـــۆ یـــادی جـــەماڵـــت ســـەری بوتخانـــەم دا
ناڵـــەی بـــوت و تەســـبیحی خـــودام گـــوێ لـــێ بـــوو

## ۳۷٥

ئـــەو کاتـــە کـــە دەردی چـــاوی تـــۆم گـــوێ لـــێ بـــوو
دڵ خـــوێنی ڕژا ئـــەو خەبـــەرەی گـــوێ لـــێ بـــوو
ئـــەی چابێتـــەوە چـــاوی تـــۆ بـــا ســـەیرم کـــا
دەک کـــوێر بـــێ ئـــەوەی ئـــەو خەبـــەرەی بـــە دڵـــی بـــوو

### ۳۷٦

دڵ هـــات و لـــە ئـــەم دەشـــتە گـــەلێ هـــات و چـــوو
گشـــت مـــوویی ڕەشـــی بـــوو نـــەوەکی چـــەرموو بـــوو
گـــــەرچی تەمـــــەنم هـــــەزار خـــــۆری داگـــــرت
ئـــــاخر لـــــە دوای زەڕڕەیـــــەکی مانـــــدوو بـــــوو

### ۳۷۷

دووپشـــک ســـەری زولفـــی یـــار ومانـــگ پەیکـــەری ئـــەو
ئێســـتاش هـــەموو هـــەر نـــازی شـــەوە پەرچـــەمی ئـــەو
شـــیرینە دەمێـــک شـــەهدی لـــە شـــەکری دایـــە
فەرمانبـــــەرە ڕۆژگـــــار و، فەرمانبـــــەری ئـــــەو

### ۳۷۸

ئـــــەو مانگـــــە وەفـــــا و جوانیـــــە ســـــامانی ئـــــەو
ئـــــەوجی فەلـــــەکی جوانیـــــە ئـــــەیوانی ئـــــەو
خـــۆری ڕوخـــی چاولێکـــە، ئەگـــەر نـــەت تـــوانی
ئـــەم زولفـــە ڕەشـــەی ســـەیرکە جیرانـــی ئـــەو

### ۳۷۹

خواردوومــە مەیــەک کــە ڕووحــە پەیمانــەی ئــەو
مەســتم لــە کەســێک کــە عەقڵــە دێوانــەی ئــەو
شـــوعلێک لـــە دڵـــی دام و دەروونـــم ســـووتا
لــەو شــەمعەوە هــات کــە ڕۆژە پەروانــەی ئــەو

### ۳۸۰

کـــارم هـــەموو گریانـــە لـــە دووری ئەمشـــەو
نــەک دڵ لــە بــەرم مــا، نــە ســەبووری ئەمشــەو
دڵخۆشـــی شـــەوێ دی لـــە دڵـــی مـــن مـــابوو
تـــاوانی دڵـــی خۆشـــی شـــەوێ دی، ئەمشـــەو

### ۳۸۱

کــوا تــازە دڵێــک، بۆمــە کــە کارێــک بــێ لــەو
هـــەر ناڵەیـــە ڕۆژێ بـــە هـــەزاران دێ لـــەو
شــەرتم ئــەوە بــێ، بــە گریــە ڕێگــەت تەڕکــەم
نــەیزاری ســەوز بێتــەوە ناڵــەش بــێ لــەو

## ٣٨٢

ســـەودا لەســـەرم وەکـــوو پڵنگـــی ســـەر کێـــو
غـــەم هاتـــە ســـەرم وەک ڕەوەزی لەنـــد و کێـــو
دوورم لـــــە وڵات و لـــــە غـــــەریبی مـــــاوم
وەک شـێری لـە نـاو بـەحر و نـەهـەنگی سـەرکێو

✽✽✽✽✽

# پیتی (ۆ)

٣٨٣

ئـــەی لـــە نـــاو دڵـــم ئەصـــلی تەمـــەننا هـــەر تـــۆ
وەی لـــە نـــاو ســـەرم هـــەوێنی ســـەودا هـــەر تـــۆ
هـــەر چەنـــد لـــە زەمـــان و لـــە جیهـــان دەڕوانـــم
ئـــەمڕۆ کـــە هـــەموو ئـــەتۆی لـــە مـــەو دوا هـــەر تـــۆ

### ٣٨٤

ئەی لە دڵ و لە گیان و صووڕەتم دا هەر تۆ
خوازیاری هەموو، لە دین و دنیا هەر تۆ
هاوڕێی هەموانی و بێ هەموانیش هەر تۆ
ئەی بۆ هەموو هاوڕێ، لە جیهاندا هەر تۆ

### ٣٨٥

ئەی خالقی ئاسمان و ڕەحمانم تۆ
بەخشەندەیی تاوان و گوناهانم تۆ
وا دێمە پەنات باری گوناهم پێیە
ڕێکی خەوە کرداری پەرێشانم تۆ

### ٣٨٦

ئەی خالقی بێ وێنە وو سوبحانم تۆ
سەرمایەیی دینداری و ئیمانم تۆ
شێواوە سەرم هیچ لە دەستم نایە
فەریام کەوە ئەی خاوەنی جیهانم تۆ

### ٣٨٧

ئـــەی خـــالقی (ذوالجـــلال) و ئـــەی ڕەحمـــان تـــۆ
ئـــەی ڕێبـــەری کـــاری بـــێ ســـەر و ســـامان تـــۆ
نامـــــەرد و دەغـــــەڵ بهێنـــــە ژێـــــر فـــــەرمانم
خـــامۆش بکـــە بـــۆ مـــن ڕقـــی، زۆرداران تـــۆ

### ٣٨٨

یـــاری تـــۆ ئەگـــەر ســـەری گرانـــە بـــۆ تـــۆ
غـــەم دانـــەگری، کـــە میهرەبانـــە بـــۆ تـــۆ
دڵـــداری تـــۆ وەک ئاوێنـــە خـــۆ دەنـــوێنێ
تـا سـەیری نـەکـەی سـەیری نییـە ئـەو بـۆ تـۆ

### ٣٨٩

یـەک لوقمـە لـە سـفرەی زاڵمـان مـەی خـۆ تـۆ
دووپشـــکی ڕەش و دەرد و بەڵایـــە بـــۆ تـــۆ
گـەر بـۆ دڵـی تـۆ وەکـوو عەسـەل شـیرین بـێ
ئـــەو خـــوێنی دڵـــی خـــەڵکی هـــەژارە بـــۆ تـــۆ

٣٩٠

ئـەی کەعبـە پەرەسـت هـۆی چیـەکینـی مـن و تـۆ
خـاوەن نـەزەران ئـەبینن بـەینی مـن و تـۆ
گـەر کـوفری مـن و دینـی تـۆ هەڵسـەنگێنن
ئـەو کاتـە ئـەزانن، لـە یـەقینـی مـن و تـۆ

٣٩١

ئـەی دڵ غـەمی ئـەو، مـارە بـڕاوی مـن و تـۆ
سـەر داخـە ئـەوین مایـەیی ژیـانی مـن و تـۆ
بـۆ چێـژی غـەمان دیـارە نـەفامی ئـەگینا
یەکـدەم غـە مـی ئـەو نرخـی ژیـانی مـن و تـۆ

٣٩٢

یـاڕەب، لـە دوو عالـەم بـێ نیـازم بکـە تـۆ
بـەم تـاجی هـەژاری، سـەرفرازم بکـە تـۆ
بـۆ ڕێگـەیی تـۆ مـەحرەمی ڕازی تـۆ بـم
لاڕێ بـم لـە هـەر کـارێ بـە حـاڵم بگـە تـۆ

٣٩٣

ئـــەی مەشخەڵی (طور) شـــوعلەیی پــڕ نـــوورە لـــە تـــۆ
شـــــەیدایی دڵ و دیـــــدەیی (منصــــــور)ە لـــــە تــــۆ
جیهـــان هـــەموو ئـــی تۆیـــە نـــەوەک غـــەیری تـــۆ
ئێســـــتا دڵ و دیـــدەی منــــە مــــەخموورە لــــە تــــۆ

٣٩٤

جیهـــانی ژیـــان یـــەک ســـەرە پـــڕ ئـــاوە لـــە تـــۆ
ئـــەم ڕەنگـــی گـــوڵ و ســـەوزە وو کانیـــاوە لـــە تـــۆ
موحتـــاجی غـــــەمی عــــەشـــق و ئـــــەوینت ئێمــــە
زیـــاتر لـــەوە ئـــەم عەقڵـــە، کـــە تێـــر ئـــاوە لـــە تـــۆ

٣٩٥

وابـــادەوە تـــۆ، هـــەرچی کـــە هـــەی بـــادەوە تـــۆ
لاڕێ مـــــــەڕۆ دووبـــــــارە وەرە بـــــــادەوە تـــــــۆ
دەرگـــەی کـــەڕەمم قـــەت لـــە ســـەرت داناخـــەم
ئەتبەخشـــم ئەگـــەر تۆبـــە بکـــەی، بـــادەوە تـــۆ

## ٣٩٦

دەردی دڵی من کەسێکی دەیزانی تۆ
ڕزگاری دڵم بەندە بە فەرمانی تۆ
خنکاوی هەڵەم باری گوناهم پێیە
چۆن دەکرێ کە بیشارمەوە ئەیزانی تۆ

## ٣٩٧

ئەی ڕووگەیی ئەوکەس کە دەبینێ ڕووی تۆ
کام دڵ هەیە دڵ بێت و نەبینێ ڕووی تۆ
ئەمڕۆکە کەسێک کە ڕووی لە تۆ وەرگێڕا
دوا ڕۆژ بە چ ڕوویێکی دەبینێ ڕووی تۆ

## ٣٩٨

ئەی چارە سەری دەردی هەژاران لای تۆ
ڕازی دڵی هەر دار و نەداران لای تۆ
چۆن باسی بکەم حاڵی دڵی شێواوم
نابێژەیی کوێر وکەڕ و لاڵان لای تۆ

٣٩٩

ئـــەی ڕەونـــەقی دینـــی بوتپەرەســـتان لای تـــۆ
وەی غـــاڕەتی دینـــی هـــەر موســـڵمان لای تـــۆ
کـــوفرلای مـــن وعیشـــق لای مـــن وزننـــار لای مـــن
دڵ لای تـــۆ و دیـــن لای تـــۆ و ئیمـــان لای تـــۆ

٤٠٠

ئـــەی ســـەوزەیی ســـەوزایی بـــەهاران ئـــی تـــۆ
وەی قرمـــزی ڕووی لالـــە عـــوزاران ئـــی تـــۆ
ئـــاهی دڵ و ئەشـــکی بـــێ قـــەراران بـــۆ تـــۆ
هـــاوارە کـــە بـــا لـــە تـــۆ و بـــاران ئـــی تـــۆ

٤٠١

شـــەوگاری درێـــژم، ئـــەی دریغـــا بـــێ تـــۆ
مـــن نوســـتوو لـــە نـــازم، ئـــەی دریغـــا بـــێ تـــۆ
دووری و جـــودایی، ئـــەی دریغـــا بـــێ تـــۆ
پەلکێشـــی گونـــاهم، ئـــەی دریغـــا بـــێ تـــۆ

٤٠٢

دوورم من ئەگەر لە سەروەری خزمەتی تۆ
ئاوێنەیەکی پاکە دڵم بۆ ڕوخی تۆ
دوور بوونم لە دیدارت ئەگەرچی سەختە
بێ باکم لە ژێر لوتف و سەفای دەوڵەتی تۆ

٤٠٣

ڕۆژێکی هەڵاتم لە غەمی دەردی تۆ
ویستم کە ڕەها بم لە غەمی عەشقی تۆ
عەشقی تۆ کە هات لە نیوە، ڕێگەی گرتم
وەک جانی لە ئەستۆمی کرد زنجیری تۆ

٤٠٤

زاهید هەڵەیە ، پێی وەیە (قهاری) تۆ
من پڕ لە هەڵەم پێم وەیە (غفاری) تۆ
دەتناسی بە قەههار و بە غەففاریش من
کام بەندەیە لایق ترە بۆ کاری تۆ

٤٠٥

ئـــەی خـــالقی مـــن نیمـــە خـــودا غـــەیری تـــۆ
جیهـــان هـــەموو بـــووژاوە لـــە بـــەر خێـــری تـــۆ
ڕوحمـــم پـــێ بکـــە تـــاو و تەمـــەن بـــەر بـــا چـــوو
دامـــاوم لـــە دەس کـــارم، لـــە بـــەر شـــەرمی تـــۆ

٤٠٦

بـــەر گـــوێم دەکـــەوێ دەڵـــێن: کـــە نامبەخشـــی تـــۆ
هـــەرجێ کـــە شـــکاوێکە لـــە ئـــەو جێگـــەی تـــۆ
ئێمەینـــە شکەســـت خـــواردوو لـــە دەرگـــاهی تـــۆ
بـــۆ حـــاڵی شـــکاوان، چییـــە فـــەرمانی تـــۆ

٤٠٧

پـــێم وت بـــە دڵـــم کـــە چۆنـــە دنیـــا بـــۆ تـــۆ
دڵ چـــاوی پـــڕ ئـــاو کـــرد و دەگریـــا بـــۆ تـــۆ
دەیـــوت کـــە دەبـــێ چـــۆن ببـــێ ئـــەحواڵی کەســـێک
ئـــەو کـــەس بـــە ئومێـــدی تـــۆ دەژی و، ژیـــا بـــۆ تـــۆ

٤٠٨

ئـــەو دەم کـــە لـــە مـــن دەکێشـــێ دامـــەن دڵـــی تـــۆ
هـــاوارە لـــە مـــن کڵـــۆڵ و خەرمـــەن غـــەمی تـــۆ
گـــەر عـــومر وەفـــا بکـــا دڵـــی خـــۆم جارێـــک
وا دوورخەمـــــەوە تیشـــــکی نـــــەداتێ غـــــەمی تـــــۆ

٤٠٩

ئـــەم کۆمەڵـــە خەڵکانـــە بـــە جـــێ دێڵـــی تـــۆ
یـــانی کـــە بـــەرەو ئێمـــە لـــە ســـەر هێڵـــی تـــۆ
ئـــەم پەتکـــە کـــە ڕاتخســـتوە گـــرێ کـــوێرەی بـــۆ
ناچـــاری کـــە ئـــەم ژینـــە بـــەجێ بێڵـــی تـــۆ

٤١٠

گاشـــانە لـــە دەســـت پەرچـــەمی لـــەیلایی تـــۆ
گـــا بـــۆ دڵـــی مـــەجنوونی لـــە ســـەودایی تـــۆ
گـــا ئاوێنـــە ڕوو بـــە ڕووی جـــەماڵی یووســـف
گـــا ئـــاگری خـــەرمانی زولـــەیخایی تـــۆ

٤١١

ناکـــامم لـــە ئێســـتاوە لـــە خۆکـــامی تـــۆ
ســـووتان و برینـــی مـــن لـــە بـــەر خـــاوی تـــۆ
وام پـــێ مەکـــە تـــا لـــە عـــەشـــقی تـــۆ ڕیســـوا بـــم
ڕیســـوا بـــوونی مـــن باعیســـی بـــەد نـــاوی تـــۆ

٤١٢

ئـــەی نالـــەیی پیـــری خانـــەقا بـــۆ غـــەمی تـــۆ
گریـــانی وچـــەی بـــێ دەســـەڵات بـــۆ غـــەمی تـــۆ
بـــانگی کەڵەشـــێری ســـەحەری بـــۆ غـــەمی تـــۆ
ئـــاه، بـــۆ غـــەمی تـــۆ، هـــەزار ئـــاه بـــۆ غـــەمی تـــۆ

٤١٣

ئـــەی نالـــەیی پیـــری شـــڕەپۆش بـــۆ غـــەمی تـــۆ
وەی نـــەڕڕەیی ڕەنـــدی مـــەی فـــرۆش بـــۆ غـــەمی تـــۆ
هـــاواری موغـــانی بـــادەنۆش بـــۆ غـــەمی تـــۆ
خـــوێنی دڵـــی عاشـــقان بـــە جـــۆش بـــۆ غـــەمی تـــۆ

٤١٤

دڵ چیـــە کـــە بڵـــێم قـــەدری هەیـــە بـــۆ غـــەمی تـــۆ
لـــەش چیـــە کـــە بڵـــێم نرخـــی هەیـــە بـــۆ غـــەمی تـــۆ
لوتفێکـــە کـــە دەیکـــا غـــەمی تـــۆ بـــۆ دڵـــی مـــن
ئـــەی نـــا دڵـــی تـــەنگی مـــن چ جێگـــەی غـــەمی تـــۆ

٤١٥

ئـــەی ناڵـــەیی بـــێ بـــاوک و هـــەتیو بـــۆ غـــەمی تـــۆ
خـــاڵی نـــەبێ یـــا خـــوا دڵـــی مـــن لـــەو غـــەمی تـــۆ
مســـــکین منـــــی بێچـــــارە لـــــە ئـــــەم عالەمـــــە دا
شـــێواوە ســـەرم وەک ڕەشـــەبا بـــۆ غـــەمی تـــۆ

٤١٦

بەرداشـــی زەمـــان خـــوێن دەتکـــێ بـــۆ غـــەمی تـــۆ
بێگانـــە وو خۆمانـــە نییـــە بـــۆ غـــەمی تـــۆ
پێمخۆشـــە غـــەمت بـــە جـــارێ مـــەی نۆشـــی کـــەم
تـــا دوایـــی بـــە کـــەس نـــەهێڵم چۆڕێـــک غـــەمی تـــۆ

٤١٧

ئەی هاتەوە گیان بۆ سەری لێو، بۆ غەمی تۆ
تەنگ بۆتەوە دنیا لە دڵم بۆ غەمی تۆ
هۆ، ئەی دڵ و دیدە با وەسەر خۆمی کەم
خاک و گڵی کۆبانێ هەمووی بۆ غەمی تۆ

٤١٨

گیانم لە بەدەن زیندو بە خاتر غەمی تۆ
بێگانەیی عالەم ئاشنا بۆ غەمی تۆ
ڕوحمێکە کە دەیکا غەمی تۆ بۆ دڵی من
ئەی نا دڵی تەنگی من چ جێگەی غەمی تۆ

٤١٩

هەورێکە کە خوێنی چاو دەڕێژێ غەمی تۆ
ژەهرێکە کە تریاکی نییە دژ، غەمی تۆ
دەردی غەمی تۆ خەرمەنی ڕەنج کێشاوان
یەکجاری دەبا لە دینی دەشوا غەمی تۆ

٤٢٠

ئـــەی ئـــەو کـــە بـــە جێهێنـــەری کـــارانی تـــۆ
هـــەم زامـــن و هـــەم کـــافیی کـــارانی تـــۆ
شـــەرمێ دەکـــەم ڕازی دڵ لـــە ڕووی تـــۆ بێـــژم
زانـــا بـــە نـــەهێنی دڵ و ڕازانـــی تـــۆ

٤٢١

ئـــەی شـــەمعی دڵـــم قامـــەتی میزانـــی تـــۆ
ئـــەی لـــە نـــاو ســـەرم هـــەوێنی ســـەودایی تـــۆ
وەک ئاوێنـــە دڵ پـــڕ بـــوو لـــە ڕوخســـاری تـــۆ
ســـەیری تـــۆ دەکـــەم بـــەڵام لـــە ڕووی چـــاوی تـــۆ

٤٢٢

ئـــەی ئەوکەســـی بـــێ وێنـــە وو ڕەحمـــانی تـــۆ
ســـــامانی هـــــەژاران و نـــــەدارانی تـــــۆ
ئـــەم خەڵکـــە هـــەموو چـــاوی لـــە دەســـتی تۆیـــە
بـــا بـــڕژێ کـــەمێک ڕەحمـــەتی بـــارانی تـــۆ

## ٤٢٣

دڵ نادەم بە دنیایە بە فەرمانی تۆ
بۆ سوود و زیان ملکەچی فەرمانی تۆ
دانیشم لە سەر ئاگر ئەگەر تۆ بێژی
دەست هەڵدەگرم لە ژین، بە فەرمانی تۆ

## ٤٢٤

ئاوێنە سفەت بە دەستی ئەو، جوانی تۆ
لەم دیووەوە خۆت ئەبینی، لەو دیوی تۆ
هەر ئەو تۆ ئەبینێ، کە هەبوونت لە ئەوە
ناتوانی ببینی ئەو و بەر عەکسی تۆ

## ٤٢٥

بێ برانەوە ئینسانی بەدی دێنی تۆ
دەشزانی کە چۆن دەبێ، خوداوەندی تۆ
ئەی خوایە گوناهی بەندە بۆ بەندەی بۆ
چوون بەندە ئەوەی دەکا کە دەینووسی تۆ

٤٢٦

بیســـــتوومە دەڵـــێن دەردی هەیـــە چـــاوی تـــۆ
پێمخۆشـــە لـــە مـــن دا غـــەم و ئـــازاری تـــۆ
یـــاڕەببی لـــە چـــاوی پیســـــی دەوران هـــەرگیز
دەردی پـــێ نـــەگا نێرگـــزی بیمـــاری تـــۆ

٤٢٧

زننـــاری پەرەســـتە، زولفـــی عەنبـــەر بـــۆی تـــۆ
دانیشـــتوو لـــە میحرابـــی خـــەمی ئـــەبرۆی تـــۆ
یـــاڕەب چ خـــوداییێکی کـــە بـــێ وێنـــەی تـــۆ
ڕووگـــەی دڵـــی کـــافر و موســـڵمان ڕووی تـــۆ

٤٢٨

ئـــەی مەبەســـتی خـــوا پەرەســـتان ڕووی تـــۆ
میحرابـــی هـــەموو جیهـــان خـــەمی ئـــەبرۆی تـــۆ
ســـــــامانی ژیــــــانی تەنگدەســــــتان زارت
دەســـپێکی دڵـــی لالـــەپەرەســـتان مـــووی تـــۆ

٤٢٩

ئـەی بـێ گـەردی ئاوێنـە لـە بـەر وێنـەی تـۆ
کـەی ئاوێنـە بینـراوە بـە بـێ وێنـەی تـۆ
نـا نـا، تـۆ بـە نـاز لـە ڕاسـتی هـەر نـەینووکێک
خـۆت هاتوویـەوە سـەیر دەکـەی وێنـەی خـۆ

٤٣٠

هـەم بێکـەس و هـەم خـاوەن و بـێ وێنـەی تـۆ
کـەس خـاوەنی مولکێـک نییـە وەک ملکـی تـۆ
ئـەم خەڵکـە لـە خـەو نوسـتوو دەرگـا بەسـتە
قـەت بەسـتە نییـە بـارەگـە وو دەرگـەی تـۆ

٤٣١

دوو دیـدە وو دڵ دەکـەم بـە قوربـانی تـۆ
گیـان و سـەر و دڵ حـازری فـەرمانی تـۆ
ئـەی خۆزگـە ئەگـەر ڕۆژێ سـەرم بخـوازی
بـە بـڕینچـێ سـەرم، نەیخەمـە ژێـر قـاچی تـۆ

❋❋❋❋❋

# پیتی (هـ)

## ٤٣٢

گەر هاتی بۆ ئەم دەرگەیە، تۆ یەک دڵ بە
هەر چیکی کە غەیری منە، لەو دوو دڵ بە
ڕۆژێکی بە پاکی وەرە بۆ دەرگاهم
گەر ڕاستم نەکرد، کاری تۆ ئەم جا سڵ بە

## ٤٣٣

ئـــەی دڵ لـــە فیراقـــی ســـەنەمم پـــڕ خـــوێن بـــە
ئـــەی دیـــدە بـــە هاوکـــاری دڵـــم لاوێـــن بـــە
ئـــەی گیـــان تـــۆ عـــەزیزتر نـــی لـــە یـــادی یـــارم
بـــێ یـــارم کـــە نـــاوێی، لـــە بـــەدەن بـــێ شـــوێن بـــە

## ٤٣٤

غـــەیری تـــۆ دڵـــم بـــە هـــەرچی بەســـتم تۆبـــە
بـــێ مـــەیلی تـــۆ هـــەر جێیـــە بوەســـتم تۆبـــە
تـــا کـــەنگێ دەبـــێ تۆبـــە نەبەســـتم بـــۆ تـــۆ
ئـــەمجارە کـــە ســـەد جـــاری نەبەســـتم تۆبـــە

## ٤٣٥

تـــا کـــەنگێ بکـــا تۆبـــە لـــە دەســـتم تۆبـــە
هـــاوار و فوغـــانی بـــێ لـــە دەســـتم تۆبـــە
هـــەر دوێنـــێ بـــە یـــەک تۆبـــە شـــکاندم شووشـــە
دووبـــارە لـــە دەس شووشـــە شکەســـتم، تۆبـــە

## ٤٣٦

گــەر بــۆ تــۆ نــەبێ کــارم دەکــەم لــەو تۆبــە
خواردوومــە غــەمێک بــێ تــۆ، دەکــەم لــەو تۆبــە
ئــەمجارە دەبــێ کــارم هــەموو بــۆ تــۆ بــێ
گــەر چــاتر لــە ئــەو ئــەبێ، دەکــەم لــەو تۆبــە

## ٤٣٧

ئــەی تۆبــە لــە دەســتی مــن تکایــە تۆبــە
ئێســـــتاکە خەجاڵـــــەتم خودایـــــە تۆبـــــە
دوێنــێ بــوو بــە یــەک تۆبــە شــکاندم ســاغەر
ئــەی ســاغەر ئــەتۆم خســتە پــەنایــە تۆبــە

## ٤٣٨

گــەر تاجــت دەوێ بــڕۆ، گــەدای گشــتی بــە
بێگانــە لــە خــۆت و ئاشــنای گشــتی بــە
پێتخۆشــە وەکــوو دەســتەگوڵــت ڕابگــرن
دەســتان بگــرە و خــاکی لــە ڕێــی گشــتی بــە

٤٣٩

لەم کۆنە جیهانە سەر و سەودا سەختە
چەپ گەردی چەوێڵ، کاری لەگەڵدا سەختە
دابڕان لە جیهان و لە گیان ئاسانە
زیزبوون چ لە ڕوودا، چ لە دڵدا سەختە

٤٤٠

ڕێگەم کە بەرەو دامەنی وەصڵت سەختە
دانی دڵ بە ئەزموونی فیراقت سەختە
ژانی دڵ و ژانی غەم و ژانی دووری
بوون، سەختە لەگەڵ تۆ و نەبوونت سەختە

٤٤١

هۆ خاڵە بۆ مردنت، غەمت پێویستە
بۆ دیدە وو دڵ، سۆز و نەمت پێویستە
تۆ کاتت گەلێکە کە بە دنیا ڕاگەی
بۆ ڕۆژی مەرگ، چارەسەرت پێویستە

٤٤٢

عیشـــقم، غـــەمی تـــۆ ســـەری تـــەڕی پێویســـتە
ڕاوی تـــۆ لـــە مـــن بـــە هێزتـــری پێویســـتە
مـــن ئـــەو مەلەمـــە بـــە شـــوعلەیەک بـــرژاوم
ئـــاگری تـــۆ بـــە تـــین، ســـەمەندەری پێویســـتە

٤٤٣

هـــەر ئـــەو کەســـەمە لـــە خـــاک و کـــردی خۆتـــە
نەخشـــی مـــن بـــە ئـــارەزوو و بـــە نەخشـــی خۆتـــە
هەوســـــاری منـــــت بـــــۆچی بـــــە دەســـــتم داوە
دەڕوێمـــــەوە لـــــەو تـــــۆوە، پەســـــەندی خۆتـــــە

«ئەســـعەد» تـــۆ لەشـــت ســـتوون و خێمـــەی ڕووتـــە
فەرمانـــــدە ڕوحـــــە و مـــــەنزڵی ئـــــەو لاهووتـــــە
ســـەرکاری ئەجـــەل، کـــاتێ کـــە ڕووحـــت دەڕوا
دەی پێچێتـــــەوە خێمـــــە، لـــــە ئـــــەم ناســـــووتە

ئەم چوارینە هی: وەرگێڕە

٤٤٤

دنیـــایی دەنـــی و پــڕ لـــە هـــەوەس بـــۆ چیتـــە
ئـــالوودە بـــە هـــەر ناکـــەس و کـــەس بـــۆ چیتـــە
ئـــەو یـــارە بخـــوازە بـــە تـــەنێ بـــۆ تـــۆ بـــێ
مەعشـــووقەیـــی هـــەر ناکـــەس و کـــەس بـــۆ چیتـــە

٤٤٥

دیـــل بوومـــە بـــە دەســـت چـــاوی خومـــاری بـــادە
کـــارم بـــە دەوام لـــە دەســـتی تـــۆ فـــەریادە
گـــەر داتـــەوە دادی دڵەکـــەم ئـــەی ئۆخـــەی
ئـــەی نـــا، مـــن و دڵ هـــەرچـــی بکـــەم بـــەر بـــادە

٤٤٦

وتـــم ئـــەی چـــاوت وتـــی: لـــە مەســـتان لادە
وتـــم ئـــەی زارت وتـــی: لـــە خونچـــان لادە
وتـــم ئەگریجـــە وتـــی: دیـــارە ســـەرت شـــێواوە
باســـی چ دەکـــەی حیکایـــەتی بـــێ وادە

٤٤٧

ئەی چاکە نەکردوو ئەی خراپت کردە
ئێستا بۆ ڕەها بوونت ئومێدت، کردە
پاڵت وە عەفوو داوە کە هەرگیز نابێ
بێ کردی لە کردان و نەکردت کردە

٤٤٨

زاهید کە بە مانگرتنی کردی کردە
مەیخۆرە خەجاڵەت لەوەیە بێ کردە
ترسم لەوەیە ترس و ئۆمێد ڕۆژی جەزا
بێ کردەوە کردە، کردەوە بێ کردە

٤٤٩

چەند حەیفە، تەمەن ڕۆیی لە سەر بێهوودە
هەم لوقمە حەڕام و هەم نەفەس ئالوودە
فەرمایشی بێ کردە پەشیمانم لەو
شەرمەندە لە کردەکانی بێ فەرموودە

٤٥٠

ئـــــالووده بــــە دنیـــا جگـــەری تییـــره تــــره
ئاســـووده تـــره ئـــەوەی کـــە بـــێ لییـــره تـــره
هــــەر بـــارەبـــەرێک بــــە زەنگوڵــــە و زنجیـــره
گـــەر ســـەیری بکـــەی بـــاری ملـــی زێـــده تـــره

٤٥١

بێجگـــــە لـــــە جینـــــان بۆمــــە جیهـــانێکی تــــره
دوای دۆزەخ و فیــــــردەوس، زەمـــــــانێکی تـــــره
مــــەی خــــواردن و دڵدارییــــە ســــامانی مــــن
زۆربێـــژی لـــە زاهییـــد و لـــە یـــەکێکی تـــره

٤٥٢

مــــــەجنوون و پەرێشــــــانم و دەســــــتم بگــــــره
سەرگەشـــــته و حـــــەیرانم و دەســـــتم بگــــره
هـــەر بـــێ ســـەر و پـــا خـــاوەنی چاوســـاغێکه
مـــن بـــێ ســـەر و ســـامانم و دەســـتم بگـــره

٤٥٣

ئـــەی پشــــت و پـــەنای هەرکەســـێ دەســــتم بگـــرە

ســــڕبوومە لـــە ژانــــە ژیــــن و دەســــتم بگـــرە

تـــا کـــەنگێ بکـــەم تۆبـــە و هـــەڕڕاجی کـــەم

ئـــەی تۆبـــەبـــەر و تۆبـــەدەر، دەســــتم بگـــرە

٤٥٤

زانابـــــە بـــــژی، ئـــــەی دڵ و زانــــا بمــــرە

گـــەر ڕێـــڕەوی مـــەنزڵ بـــی لـــە ڕێگـــا بمـــرە

ژینـــــی بــــێ ئـــــەوین چ لـــــەززەتی تێدایـــــە

گـــەر وابـــی، بـــژی، وانـــەبی، ئێســـتا بمـــرە

٤٥٥

سۆفســتی لــە عــەقڵ و لــە هونــەر، بــێ خەبــەرە

پێــی وایــە جیهــان، خــەون و خــەیاڵ و گــوزەرە

نــەیزانی جیهــان ئەوپــەڕی هــۆش و هونــەرە

لــەم هۆشــە بەدیهێنــەری ئــەو، جیلوەگــەرە

٤٥٦

وەبزانە کە قورئان و (صُحُف)ت، لەبەرە
چی پێوە دەکەی زاڵمی نەفست لەسەرە
بۆ سوژدە سەرت بۆچی ئەخەیتە سەر ئەرز
فیزێک لە سەرت دایە ئەوت دەردەسەرە

٤٥٧

یارەب، دڵی من بە غەیری خۆت مەسپێرە
دێمەی دڵەکەم بە ئاوی خۆت بیدێرە
ڕۆژانە دەڵێم، هیچ لە دەستم نایە
ڕوحمم پێ بکە، دڵم بە خۆت بسپێرە

٤٥٨

هەرکەس، لە دڵ و لە سینەدا بێ ڕازە
زیندوو بە سەرە، بەڵام لە دڵ بێ وازە
جا هەستە وەرە بە دڵ بخوازە دەردێک
دەردێکی لە دڵ زیاتر و بێ ئەندازە

٤٥٩

لەو حاکمی زۆرداره عەدڵ مەخوازە
لەو دەستە کە مردوونە مەدەد مەخوازە
بۆ پێنج و شەشێکی کە لە دنیا ماوی
ئازاری دڵی تاقەکەسێک مەخوازە

٤٦٠

سامانی ژیانی من و تۆ یەک نەفەسە
هەر ئەم نەفەسە، بە خاتری هەم نەفەسە
بۆ هاونەفەست بێت و کەمێک دانیشی
سەر پاکی ژیان، ژیانی ئەو یەک نەفەسە

٤٦١

تەسبیحی درێژت کە لە دەست بێ، خاسە
جامێکی شەڕابیشت لە دەست بێ، خاسە
دەتکوت چ بەرم دیاری لە بۆ ئەم یارە
بێ دەرد کە مەڕۆ، هەرچی لە دەست بێ خاسە

## ٤٦٢

لەو خەڵکی کە دووڕوو بێ سەرت داپۆشە
لەو دەستە کە بێ مایە بێ ڕوو داپۆشە
هەمپیاڵە مەبە لەگەڵ مرۆڤی نامەرد
کونجێکی پەیا کە با بڵێن خامۆشە

## ٤٦٣

گەر ئاگر بدەی ئەوەی دڵت بەو خۆشە
ڕازی دەبێ دڵ، حەقیقەتی پێخۆشە
لاهووتت دەوێ، پەردە لە دنیا کێشە
دوو یار و دڵێك ئەستەمە، دەرد وئێشە

## ٤٦٤

ڕێگای تۆ لە هەر ڕێیە بە دەست بێ خۆشە
وەصڵی تۆ لە هەر لایە بە دەست بێ خۆشە
ڕوخسارت بە هەر دیدە ببینرێ جوانە
ناوت کە بە هەر زوانێ بگوترێ خوشە

٤٦٥

هــــاودەم دڵـــی بــۆ تــۆ بـــێ، هــەبوونی خۆشــــە

بـــۆ هـــاودەمی بـــێ وەفـــا، نـــەبوونی خۆشــــە

کاتێـــــک دەســـــەڵات لـــــە دەس ســــــتەمکارانە

پەیوەنــــدی بـــە ملکـــــی بێنـــەوایی خۆشـــــە

٤٦٦

فەرمووتـــــە فـــلان بـــۆچی ئـــــەوا خامۆشـــــە

بـــادەی کـــێ گـــڕی داوە ئـــــەوا مەدهۆشـــــە

زۆر عەیبـــە ئەمێســـتاش ئـــەوە خــاکی دەرگـــات

لــــە بلێســـــەی دەروونــــی منـــــە وا پڕجۆشـــــە

٤٦٧

تاکـــەی لـــە جیهـــانی پـــڕ بـــەلا ئەندیشــــە

تـــا چەنـــدە لـــە گیـــانی بـــێ هیـــوا ئەندیشــــە

دوژمـــن ئـــەوی بســـتێنێ لـــە تـــۆ بـــاری لەشـــە

مەردانـــــە بـــژی، هـــەر لـــە خـــودا ئەندیشــــە

٤٦٨

گیـــان چیــە؟ بــۆ غـــەم و دەرد و موســـیبەت هەدەفـــە
دڵ چیــە؟ کــە لــە سینە دا هــەمووی ســۆز و تەفــە
ئێســـتا بـــۆ نـــەمانی مـــن و تـــۆ بەســـتوویە ســـەف
مـــردن تـــەڕەفێک، ژیـــانی ســـەخت، لـــەو تەڕەفـــە

٤٦٩

دەگـــــریم لـــــە غـــــەمت زار و دەفـــــەرموی زەڕقـــــە
چـــۆن زەڕقـــە ئەمـــە، دیـــدە لـــە خـــوێن دا غەڕقـــە
پێـــت وا نـــەبێ دڵ گشـــتی وەکـــوو یـــەک وابـــن
نـــا نـــا، ســـەنەمم، لـــە نێـــو دڵان زۆر فەڕقـــە

٤٧٠

ئەوکـــەس کـــە حـــەڵاڵ زادە وو شـــیری پاکـــە
قـــەت عـــەیبێ لـــە کـــەس نـــاگرێ دیـــدی پاکـــە
ئەوکـــەس کـــە لـــە دوای عـــەیبی مـــن و تـــۆ دایـــە
مـــەمکێکی کـــە مشـــتوویە، نـــە شـــیری پاکـــە

٤٧١

ئــەی ناگــا بــە زاتــی تــۆ، ئــەوەی ئیدڕاکــە
عالــەم کــە لــە ڕاســتی کــەڕەمت خاشــاکە
گــەر تــۆ بــە کــەڕەم بێــی و ببەخشــی هــەموان
بەخشــینی هــەموو بــۆ تــۆ، نــە مســتێ خاکــە

٤٧٢

ســــاتێکی چــــرای ئارەزووانــــت پــــف کــــە
ســەرفی نــەزەرت لــە جــوانی هــەر یووســف کــە
لــەم شــەهدە بــە کامێــک لــە گــەروت دەخشــێنم
لــەم لەززەتــە گــەر مەســت نــەبووی، تــۆ!! تــف کــە

٤٧٣

هــاوار لــە دەســی ئــەم فەلەکــەی وەک ســەلکە
جێگــەی مــن نــە ئــەم جێگەیــە زۆر بــێ کەلکــە
بــــەم حاڵەشــــەوە شــــوکری ئــــەوم پێویســــتە
تونــدتر لەوەشــم کــا، کێیــە بێــژێ مەیکــە

٤٧٤

یـــارەب، وەرە ڕوحمێکـــی بکـــە و شـــادم کـــە
ناڵـــەی دڵـــی مـــن کۆکـــەوە هـــەمڕازم کـــە
ئەوکـــەس کـــە ئـــەمن لـــە تـــاوی ئـــەو غـــەمبارم
ئـــەو بـــە مـــن و بـــە دڵ، پێکـــەوە دەمســـازم کـــە

٤٧٥

یـــارەب، بـــە کـــەرەم ســـەیری گوناهـــانم کـــە
ڕوحمێـــک بـــە منـــی مانـــدوو، لـــە ئامـــانم کـــە
وام پێـــــمەکە، وەک ئـــــەوەی مـــــن کـــــردم
تـــۆ ڕوحمـــێ بـــە حـــاڵ و ســـەر و ســـامانم کـــە

٤٧٦

پـــێم وت لـــە دڵـــم وتـــی: کـــەبابـــت کـــەم کـــە
وتـــم ئـــەی چـــاوم وتـــی: خـــەیاڵت کـــەم کـــە
وتـم ئـەی گیـانم وتـی: کـە لـەو عالـەمی عـەشـق
زۆرانـــە، خـــراپ، هەســـتە خراپـــت کـــەم کـــە

٤٧٧

پێتخۆشـــە بڵنـــد بـــی، وەرە مەســـتی کـــەم کـــە
جێگـــەی تـــۆ نـــە ئـــەم جێگەیـــە پەســـتی کـــەم کـــە
ئەگریجـــە بوتـــان و، دەســـتدرێـــژی کـــەم کـــە
بـــێ ســـووچە ســـەنەم، تـــۆ بـــوت پەرەســـتی کـــەم کـــە

٤٧٨

هـــۆی غـــەم، گـــوزەرێ لـــە خێڵـــی بـــەدناوان کـــە
فکرێـــک بـــۆ منـــی بـــێ ســـەر و بـــێ ســـامان کـــە
لـــەو پیاڵـــە شـــەڕابەی کـــە لێـــوا و لێـــوە لـــە غـــەم
جـــورعێکی لـــە زاری بـــێ ســـەرئەنجامان کـــە

٤٧٩

یـــاڕەب، بـــە کـــەڕەم چـــاوێ لـــە عەبـــدی خـــۆ کـــە
چاوێـــک لـــە مـــن و چـــاو لـــە بڵنـــدی خـــۆ کـــە
هـــەر چەنـــدی کـــە نـــیم، لاییقـــی بەخشـــینی تـــۆ
ڕوحمێکـــی بـــە مـــن، لـــە بـــەر خـــودایی خـــۆ کـــە

٤٨٠

ئـــەی نـــۆ لـــە دڵ و دوو دڵـــە، هـــەژدەی یەلـــە کـــە
بـــازاڕی ئـــەوان کۆکـــەوە، ڕوو لـــە چلـــە کـــە
ڕۆژێـــک ســـەحەری پـــەنا بـــەرە بـــۆ (اللە)
گـەر سـەر نـەگرێ کـاری تـۆ، ئـەم جـا گلـە کـە

٤٨١ (دوعا بۆ کوڕەکەی)

یـــاڕەب، لـــە خـــەوی نـــازەوە بیـــداری کـــە
لـــەو مەســـتی جـــووانی بەســـە هوشـــیاری کـــە
یـــا بـــێ‌خەبـــەری کـــە، کـــە نـــەزانێ کێیـــە
یـــا نـــا، تـــۆ لـــە حـــاڵی خـــۆ خەبـــەردای کـــە

٤٨٢

ئـــەی شـــەمعی دڵـــم مەوەســـتە تـــۆ زاری کـــە
ئـــەی ئـــاهی جگـــەر ســـۆز، تـــۆ ســـوپاداری کـــە
بـــۆ خزمـــەتی حـــەق، ڕووت و ڕەجـــاڵی ئـــەی دڵ
دانـــت لـــە جگـــەر بگـــرە، جگـــەر خـــاری کـــە

٤٨٣

پـــێم وت کـــە ڕوخـــم زەردە و، تـــۆ ســـووری کـــە
کـــــرداری خـــــراپم فـــــرە، مەســــــتووری کـــــە
فـــەرمووی کـــە ئەگـــەر ژوانـــی مـــن دەخـــوازی
بیشـــت کـــوژم نـــا نـــا، لـــە ســـەرت دووری کـــە

٤٨٤

کـــــرداری خـــــراپم هەیـــــە ژێـــــر خـــــاکی کـــــە
دژواری جیهـــــــان زۆرە لـــــــە دڵ پـــــــاکی کـــــــە
ئەمرۆکـــە بـــە خێـــوم کـــە لـــە دنیـــای دیکـــە
هـــــەوراز و نشـــــێوم هەیـــــە تـــــۆ چـــــاکی کـــــە

٤٨٥

پـــێم وت وەی دوو چـــاوم، وتـــی: پـــڕ ئـــاوی کـــە
پـــێم وت جگـــەرم، وتـــی: بـــە غـــەم داغـــی کـــە
پـــێم وت ئـــەدی دڵ؟ وتـــی: کـــە چـــی تێدایـــە
پـــێم وت غـــەمی تـــۆ، وتـــی: بـــە خوێنـــاوی کـــە

٤٨٦

دڵ دوورە لـــــە تـــــۆ زەمـــــان درێـــــژ و تەنگـــــە
خـــــاوەن دڵـــــەکم، دەڵێـــــی لـــــە بـــــەرد و ســـــەنگە
عـــــومرم کـــــە درێژبـــــۆوە زەمـــــان پێـــــی عـــــارە
گیانێکـــــە ئەجـــــەل بـــــە بردنـــــی ئـــــەو نەنگـــــە

٤٨٧

یـــــادی تـــــۆ دەکـــــەم کـــــاتێ لـــــە باغـــــان دامـــــە
نـــــاوی تـــــۆ دەبـــــەم کـــــاتێ لـــــە یـــــادان دامـــــە
چـــۆن دەکـــرێ لـــە یـــادت کـــەم هـــەتا مـــن مـــاوم
گـــــەرچی کـــــە لـــــە ســـــەحراوو بیابـــــان دامـــــە

٤٨٨

غـــــەم عاشـــــقی نێـــــو ســـــینگی بـــــەڵا پەروەرمـــــە
خـــــوێنی دڵـــــی ئـــــارەزوو لـــــە چـــــاوی تەڕمـــــە
هـــۆی خاڵـــە، ئەگـــەر حـــەریفی ئێمـــەی فـــەرموو
هـــەر خوێنـــە لـــە جێـــی مـــەی، کـــە لـــە نێـــو ساغەرمە

٤٨٩

یارم ئەوە چەند ساڵە لە داوی تۆمە
ڕاستی لە قسەم دایە گراوی تۆمە
گەر تۆ لە وجوود بێیەدەرێ یەکجاری
پێموا سەنەمم ئێستە لە ڕاوی تۆمە

٤٩٠

گاور کە منم ئێستە موسڵمان بوومە
پەیمانم نەبوو ئێستە بە فەرمان بوومە
زولفی ڕەشی تۆ مەعدەنی موشکی عالەم
ژێر سێبەری ئەو، ئێستە پەریشان بوومە

٤٩١

بێ تۆ دەمەکی نەبوومە، تا من بوومە
تۆی هۆی سەرەکی بوونی، کە وا من بوومە
ئەم بوون و نەبوونەی من لە تۆیە تەنیا
تۆ هەی کە هەمە بێ تۆ دەنا، ون بوومە

٤٩٢

تـــاوانی جیهـــان، گشـــتی ئەگـــەر کردوومـــە

بەخشـــینم ئومێـــدە، بـــەوە دەســـت گرتوومـــە

فەرمووتـــە لـــە تەنگانـــەوە دەســـتان دەگـــرم

مەمهێڵـــەوە لـــەم حاڵـــە لـــە پـــا کەوتوومـــە

٤٩٣

بـــا حـــەک بکـــرێ ئـــەوەی کـــە مـــن نووســـیومە

دووری خەنـــەوە ئـــەوەی کـــە هەڵگرتوومـــە

بێهـــوودە بـــوو هـــەر کـــارێ لـــە پێشـــدا کـــردم

ســـەد حـــەیفم، لـــە عـــومر و دەمـــی ڕابردوومـــە

٤٩٤

ئـــەی لـــە ســـیفەت و زاتـــی تـــۆ حـــەیران ئێمـــە

بـــۆ بەنـــدەگی وەســـتاوین لـــە مەیـــدان ئێمـــە

هـــەر تـــۆی کـــە شـــیفا دەنێـــری بـــۆ بیمـــاران

ئـــەی خوایـــە بپـــارێزی لـــە دەردان ئێمـــە

٤٩٥

یـــارەب، بـــە کـــەرەم نەکـــەی پەرێشـــان ئێمـــە
داهـــــاتووە پشـــــتن لـــــە گوناهـــــان ئێمـــــە
زاتـــی تـــۆ غـــەنی و، ئێمـــە هـــەموو موحتـــاجین
ئاتـــاجی بـــە تـــۆ بـــین نـــە بـــە خـــەڵکان ئێمـــە

٤٩٦

وەک پیـــرە هـــەڵۆ هـــەموو لـــە ڕاویـــین ئێمـــە
بـــۆ زوڵـــم و ســـتەم دانـــەری داویـــین ئێمـــە
گـــەر پـــەردە لـــە ڕووی کردەوەکـــانن لادەن
وەک پـــەردە لـــە بـــێ شـــەرمی دڕاویـــین ئێمـــە

٤٩٧

ئـــەم عیشـــقە بەشـــێکە، لـــە ژیـــانی ئێمـــە
حاشـــا کـــە دەرک بکـــرێ بـــە گیـــانی ئێمـــە
خـــۆش ئـــەو کەســـە حـــەق ، نـــووری گزنگـــی لێـــدا
ئـــەو کاتـــە لـــە نـــاو دەچـــێ گومـــانی ئێمـــە

٤٩٨

لـــــەو دێـــــر و کلیســـــایە فرێـــــدەی ئێمـــــە
غـــارن دەی هـــەموو ســـاڵێ لـــە کەعبـــەی ئێمـــە
ئـــەم کـــارە هـــەموو لازمـــە بـــۆ حـــاڵی مـــە
بـــەو شـــەرتە لـــە نەفســـی مـــە، ڕەهـــا کـــەی ئێمـــە

٤٩٩

ئـــەی کـــردی غـــەمت غـــارەتی هۆشـــی دڵـــی مـــە
دەردی تـــۆ ســـەبەب، خانـــەفرۆشـــی دڵـــی مـــە
ڕەمزێـــک کـــە (بـــەرێزان)، لـــە ئـــەوی مـــەحرومن
درکانـــدی ئـــەوینت، لـــە پـــەناگـــوێ دڵـــی مـــە

٥٠٠

یـــادی تـــۆ ڕەفیقـــی شـــەوو ڕۆژانـــی مـــە
ســـەودایی دڵـــی تۆیـــە لـــە مەیـــدانی مـــە
دەرنـــاچم لـــە فـــەرمـــانی بـــەرێزت یـــارەب
تـــا مـــابێ ژیـــان، نەخشـــی لـــە ئەنـــدامی مـــە

٥٠١

دووری کە قەراری گەرەکە من نیمە
ئارامی دەروونی گەرەکە من نیمە
ئەزموونی زەمانی گەرەکە من نیمە
یانی کە ژوانی گەرەکە من نیمە

٥٠٢

ئەوکاتە لەگەڵ تۆمە لەگەڵ تۆ نیمە
سەبریش کە هەبێ بەڵام، لە بەر تۆ نیمە
بۆ بەزمی ژوانی تۆ سەرم دۆڕاوە
دوور نیمە لە تۆ گەرچی لەگەڵ تۆ نیمە

٥٠٣

گەردوون گەوەیەک، لە عومری دۆڕاوی مە
دەریا دەڤرێک لە ئەشکی سێڵاوی مە
دۆزەخ شەرەڕێک، لە ڕەنجی بێهوودەی مە
فیردەوس دەمێک، لە ساتی ئارامی مە

٥٠٤

پڕ بۆتەوە ئێستا لە گوناه جامەی مە
کەم بۆتەوە ئێستا لە دەروون ناڵەی مە
ئێژن کە قیامەت شەوی لێ دانایە
ئاخۆ تۆ بڵێی نەیکەنەوە نامەی مە

٥٠٥

دۆزەخ شەرەڕێک لە ئاگری سینەی مە
جەننەت ئەسەرێک لەو دڵە زێڕینەی مە
بێ غەم بە لە فیردەوس و لە دۆزەخ تاوێک
بەو دەرد و غەمی یاری لە مێژینەی مە

٥٠٦

ژانی سەرەکی ژانی غەمی یارانە
ژانێکی بە ژان تر غەمی دڵدارانە
ئێستاکە بە جێ نایەڵم من ئەم یارە
جیا بوونەوەکەم ژانەکی بێ ئامانە

٥٠٧

وەک نەردە جیهان و بردنەوەی دۆڕانە
نەرد بازەکەشی کاری لە کورتی دانە
دنیا بە مەسەل عەینی دوو تاسی نەردە
هەڵگرتنەوەیان بە خاتری هەڵدانە

٥٠٨

دەتگوت کە گوناه لە دەستی من ئاسانە
زانستی ئەزەل تیرە وو من نیشانە
زانستی ئەزەل کەی سەبەبی تاوانە
ئەم فکرە نە هی عاقڵە، بێ عەقڵانە

٥٠٩

دنیات کە دەوێ وەفا لە ئەو بێگانە
هەر عاقڵ و بیرمەندە لە ئەو حەیرانە
چەپگەردی فەلەک گەرەکیە دەستت ببڕێ
عاقڵ بۆ دەمێک نایەتە ئەو مەیدانە

٥١٠

مل کەچ لە خودابوونت گری ئیمانە
بۆ بوون و نەبوون چارەسەری نیمانە
وا بیرمەکەوە ئەوەی کە دەیکەی خۆتی
هەر کاری ئەوە ڕوالەتی ئەی خۆمانە

٥١١

یارەب، چ خودایێکی جەماڵت جوانە
ڕازیمە بە فەرمانت و کارت جوانە
ئەم خەڵکە دەڵێن بەهەشت ئەخوازی یا ئەو
چەند بێ خەبەرن بەهەشتی چاوت جوانە

٥١٢

دڵ ڕۆیی بەرەو ئەو کە قسەی ئەو جوانە
خۆشیم لە دڵ و بەڵام غەمی ئەومانە
گیانی دەوێ چەند ڕۆژێ گیانم نادەم
خۆ باسم لە گیانم نیە قسەی ئەو جوانە

٥١٣

ئـــەو دەنگـــە کـــە دێ ســـەیرکە ئـــەو یـــاری منـــە
مـــن خـــۆم کـــە دەزانـــم لـــە غـــەمی، کـــاری منـــە
ســێ ســـەد گـــوڵی ســـوورلـــە دەوری ڕووی یـــاری منـــە
هـــاتووم بچـــنم کـــە گـــوڵچنین کـــاری منـــە

٥١٤

ئـــەو پـــۆڕە گوڵـــەی ئـــەبینی ئـــەو ڕوویـــی منـــە
شـــەو داوێـــک دەنێتـــەوە مـــوویی منـــە
ســـەد نافـــە بـــە بـــا دەدا بـــۆنی منـــە
ئـــاگری لـــە جیهـــان داوە ئەمـــە خـــوویی منـــە

٥١٥

هێنـــدێک لـــە خـــەیاڵ و لـــە غـــڕوور کەوتوونـــە
هێنـــدێکی لـــە تـــاو حـــوور و قصـــوور مردوونـــە
هێنـــدێک لـــە یـــەقین زۆری لـــە گـــەرداوی شـــک
چەنـــد دوورە پـــەرێز بوونـــە چ دوور کەوتوونـــە

٥١٦

دەخـــــوازی ئەگـــــەر لـــــوتفی خـــــودا، دڵ بێنـــــە
بـــــۆ گێچـــــەڵ و ئـــــاژاوە کەســـــی مەدوێنـــــە
جیـــــاوازی مەکـــــە بـــــەڵکوو دڵان پێـــــک بێنـــــی
وەک خـــــۆری لـــــە ئاســـــمانەوە خـــــۆ بنوێنـــــە

٥١٧

ســـــەر ڕشـــــتەیی دنیایـــــە بـــــە دەســـــتی بێنـــــە
کـــــات و تەمـــــەنت بـــــە نرخـــــە مەیدۆڕێنـــــە
دایـــــم لـــــە هـــــەموو کـــــات و هـــــەموو جێگایـــــەک
چاوێکـــــت لـــــە یـــــارت بـــــێ دڵـــــی مەشـــــکێنە

٥١٨

ڕوو خـــــۆش بـــــە لەگـــــەڵ کەســـــێ دەڵـــــێن بـــــێ دینـــــە
قاچێکـــــت بـــــەرەو پێشـــــەوە نـــــێ بیبینـــــە
ئـــــەی گیـــــانی بـــــرا دەس بـــــە کـــــەلامت بگـــــرە
وەک مـــــاری ڕەشـــــە تۆڵـــــەوو بـــــوغز و کینـــــە

٥١٩

ئــەو کــەس کــە فــەنای بــاوەڕە فــەقری دینــە
کــاری نـــە یـــەقین و نـــە شناســـی دینـــە
ڕۆیشــــــتوو لـــــە دنیـــــا ئـــــەوە (الله) مـــــاوە
(اَلفَقـــــــرُ إِذَا تَـــــــمَّ هُـــــــوَالله) دیـــــــنە

٥٢٠

دنیـــا بـــە مەســـەل گۆزەیـــەکی زێڕینـــە
تـــاڵاوە لـــە نـــاوی نـــەوەکی شـــیرینە
تــۆ غــەڕڕە مەبــە بــە ئــەو کــە مــن دەیناســم
ئـــەم هێســـترە بـــۆ بـــارە لـــە ژێـــری زینـــە

٥٢١

مـــن دوێنـــێ دوعـــام کـــرد و خـــودا ئامینـــە
چابێتـــەوە تـــا، چـــاوی کـــە بادامینـــە
ئـــەو چـــاوە، هـــی بـــەدکارە لـــە چـــاوی داوی
بـــۆ چـــاوی ئـــەوان دەرد و بـــەڵا ئامینـــە

٥٢٢

هـــەر چەنـــدە خەبـــەرداری لــــە ئـــەولا نینـــە
بێهــــــووده تەماشـــــاگەری دنیـــــا نینـــــە
وەک نوختــــە گومـــانی دەڤـــەری پـــەڕتووکین
بێکـــارە کـــە نـــین و لــــە چ کـــارا نینـــە

٥٢٣

حـــەیفم لـــەوە دێ لـــە فکـــری خۆمـــان نینـــە
غـــــەمخۆری هــــــەژارانی پـــــەنامان نینــــە
تـــا هـــەل هـــەبێ پێنخۆشـــە کـــە دەستی ببـــڕین
ڕازی بـــە نـــەسیب و بەشـــی خۆمـــان نینـــە

٥٢٤

نامـــەرد وەکـــوو خـــۆی بـــێ فـــەڕ و نامـــەرد بیینـــە
عـــەیبـــی تـــۆ ئـــەگـــەر دانـــە بـــێ، ئـــەو صـــەد بیینـــە
تـــۆ ئاوێنـــە بـــە لێـــی گـــەڕێ بـــا سـەیـــرت کـــا
چـاکیش بـی ئـەگـەر، ئـەو بـەدە، ئـەو بـەدبیینـە

٥٢٥

دەنگێک لە غەیب بۆ دڵی من بنوێنە
ماندووی مەلی ڕووحی من لە من بڕفێنە
ئەی خوایە لە بەر خاتری مەردانی ڕێ
ون بووی مەلی دڵ بۆ دڵی من بنوێنە

٥٢٦

ئەی لەو سەری مەیدانی تۆ سەرگۆییێنە
دەرناچێ لە فەرمانی تۆ بگرە و بێنە
ڕواڵەت کە بە دەستی منە شوردوومانە
شاراوە بە دەستی تووە بێ شۆرێنە

٥٢٧

من کێمە کە ئاورم لە دڵم بەرداوە
چاوم لە هەموو خونچەدەمان لاداوە
بۆ بەزمی ئەوین هەر وەکوو ئاگر وامە
تا بگەم بە هەواڵێک کە دڵی سووتاوە

٥٢٨

ئـــاگرم بـــە دوو دەســـتی خـــۆ لـــە خـــۆم بـــەرداوە
خۆکردەیـــــە ئـــــەم ئـــــاگرە نـــــەک ڕووداوە
دوژمـــن نـــەبوو ئـــەم ئـــاگرە دوژمـــن خـــۆمم
ئـــەی وای لـــە مـــن و دڵـــم، ســـەرم شـــێواوە

٥٢٩

ئـــەی غـــەم بەســـە دووبـــارە ســـەرت هەڵـــداوە
لانـــــەت لـــــە دڵـــــم کـــــردەوە پاڵـــــت داوە
تاریکـــە شـــەوو دوور لـــە یـــار و بـــێ کـــەس
دەم کـــووژێ دەڵـــێ تـــۆ لـــە کەســـت لاداوە

٥٣٠

بێچـــارە کەســـێک دڵـــی بـــە گـــەنجان داوە
پەیوەنـــدی لەگـــەڵ خونچـــەدەمـــان نـــەبڕاوە
پێـــی وایـــە ژیـــان لـــە پـــەلکی گـــوڵ دایـــە و بـــەس
قـــاچی دڵـــی یـــەکجاری لـــە زینـــدان مـــاوە

٥٣١

زانستی وجوود کاڵە نەوەک برژاوە
پڕقیمەتە ئەم گەوهەرە کون نەکراوە
زۆر هاتن بە ژیرانە دنووکیان لێدا
خاڵی سەرەکی باسی لە سەر نەکراوە

٥٣٢

ئێستاش کە دڵم لە سەر قەراری ماوە
گیانم بۆ غەمت لە سەر مەداری ماوە
خۆشی دوو جیهانم لە دڵم دەرهێنا
تەنیا غەمی تۆ، دڵم لە یادی ماوە

٥٣٣

ئەم ئاگرە سووتێنەرە عیشقی ناوە
بۆ دین و کوفر گزینگە تیشکی تاوە
ئیمان و ئەوین دوو سەری لێک جیاوازن
بۆ کورد و عەرەب هەر یەکە ئەم سێڵاوە

٥٣٤

عـــوودم کـــە نـــەبوو، درەختـــی بـــیم هێنـــاوە
وا ڕوویـــــی ڕەش و مــــوویی ســـپیم هێنـــاوە
فەرمووتـــە بـــە مـــن کـــە نائومێـــدی کـــوفرە
هیـــوام لـــە دڵـــە و پـــڕ بـــە دڵـــم هێنـــاوە

٥٣٥

ئـــەو ڕۆژە کـــە هـــاتی وەکـــوو ئـــەمڕۆ نـــەبووە
کـــام خونچـــەدەمـــێ پێکـــەنی وەک تـــۆ نـــەبووە
هەرکـــەس دێ هـــەوڵ جـــاری وەکـــوو گـــوڵ وایـــە
قـــەت هـــاتوو لـــە دنیایـــە وەکـــوو چـــوو نـــەبووە

٥٣٦

گـــەر جێـــی لـــە حـــەڕەم یـــا لـــە کلیســـا گرتـــووە
زاهیـــد بـــە عەمـــەل تاعـــەتی لـــەو دا کـــردووە
زانســـت کـــە نـــەبێ کردەوەکـــەی چـــی لێـــدێ؟
ڕەنجـــی بـــەدەن و تـــۆزی لەبـــەر بـــا کـــردووە

٥٣٧

ئێمـــــەین لــــە پــــەنای تـــۆوە پـــەنامان گرتـــووە
پشـــتمان لـــە حـــەق و ڕوو لـــە خراپـــان کـــردووە
ئـــەو جێیـــە کـــە لوتفـــت هەیـــە قەیـــدی ناکـــا
ڕوومـــان نـــە لـــە کـــردان، لـــە نـــەکردان کـــردووە

٥٣٨

زانســـتی ئـــەزەل ســـەیرە بـــە قـــۆڵ دا کـــەوتووە
ئـــەم ســـککەیە زێڕینـــە وە ســـەودا کـــەوتووە
ئـــەو دەســـت و دەمـــی عاشـــقی مـــەردانی خـــودا
ئێســـتا بـــە مـــەقامێکی وە داوا کـــەوتووە

٥٣٩

چاکـــەت کـــە نـــەکرد گشـــتی خراپـــت کـــردووە
ئێســـتا کـــە ئومێـــدت لـــە نـــەجاتت کـــردووە
چـــاوت لـــە عـــەفوو دایـــە کـــە هـــەرگیـــز نـــابێ
بـــێ کـــردی لـــە کـــرد، کـــردی خراپـــت کـــردووە

٥٤٠

لـــەش گـــۆڕی دڵ و ئـــەو دڵـــی غـــاڕەت کـــردووە
پاکـــانی بـــە لـــەش پیســـی زیـــارەت کـــردووە
فیدیـــەی ڕەمـــەزان چـــەنـــدی کـــە ئـــەو خواردوویـــە
لـــەم جێژنـــە نـــوێژم بـــۆ تـــەهاڕەت کـــردووە

٥٤١

ئـــەم عـــومرە هـــەموو بـــە عـــەشـــقە پیـــرم کـــردووە
هـــۆش و هونـــەر و عەقڵـــە، لـــە بیـــرم کـــردووە
تـــا هاتـــە بـــەرم ڕووپـــەڕەکی یـــادی تـــۆ
هـــەرچی وەڕەقـــی خۆمـــە لـــە بیـــرم کـــردووە

٥٤٢

ڕوو ڕەش کـــە مـــنم چەنـــدە گونـــاهم کـــردووە
بەخشـــینم ئومێـــدە بـــەوە دەســـتم گرتـــووە
فەرمووتـــە لـــە تەنگانـــەوە دەســـتان دەگـــرم
فـــەریام کـــەوە مـــن عـــاجز و بـــارم کـــەوتووە

٥٤٣

لەو کەعبە دڵت کاتێ لە لای غەیری ئەوە
تاعەت نیە ئەوە، جەورە ئەوە، دێرە ئەوە
گەر دڵ بۆ خودا و هەواڵی مەیخانەی بی
بینۆشە مەترسە، ئاخیرت خێرە ئەوە

٥٤٤

هەستە وەرە ئەی بەندەی من وا وەرەوە
جێ بێڵە بوت و پەنجەی لەیلا وەرەوە
ئەم بارەگەیە بۆ نائومێدی نابێ
سەد جارت ئەگەر تۆبە لە دەستدا وەرەوە

٥٤٥

دووبارە وەرە هەستە بۆ لای من وەرەوە
گاور بووی ئەگەر بوتت پەرەستن وەرەوە
دەرگەی کەرەمم قەت لە سەرت داناخەم
گەر تۆبەت لە سەر تۆبە شکاندن وەرەوە

٥٤٦

چاوی منە خوێناویە لەم نیوە شەوە
یارەب، بە کەرەم دەرگەیەکم بۆ بکەوە
بۆ هەردوو جیهانم لە پەنای تۆ دابم
یادی تۆ نەبێ، هەرچی هەیە بی بەرەوە

٥٤٧

بۆ خاکی تۆ با خاک بمەوە چاک بمەوە
من خاکم و هەر بۆ خاکی تۆ خاک بمەوە
هەرگیز گوزەرێ ناکا غەمم بۆ لای تۆ
پەس تۆ چ غەمت، ئێستە کە غەمناک بمەوە

٥٤٨

خاوەن سەنەمێکم لە جیهان بێ تایە
خەرمانی جیهان لە چاوی ئەو بێ مایە
ئەو بووە بە ئەوینی یەکێتر من ماوم
شەمعی من لە سووتانە گڕی لێ نایە

٥٤٩

غـــازی بـــۆ شـــەهادەت لـــە تەقـــەللا دایـــە
عاشـــق کـــە لـــە ئـــەو ســـەرترە لای (الله)یـــە
بـــۆ ڕۆژی قیامـــەت نـــە وەکـــوو یـــەک وانـــە
ئـــەو کوشـــتەیی دوژمـــن بـــێ، ئەمـــەی اللەیـــە

٥٥٠

گـــەردوون و فەلـــەک گشـــتی لـــە دەســـتت دایـــە
مەســـتن لـــە شـــەڕابێکی لـــە دەڤـــرت دایـــە
بـــێ منـــەت لـــە جیهـــانیی و جیهـــانیش هـــی تـــۆ
هەریـــەک لـــە کـــەنارێکی لـــە ســـوژدەت دایـــە

٥٥١

عـــەشـــقم کـــە لەگـــەڵ ڕەگـــم لـــە پەیوەنـــد دایـــە
دڵ وەک مـــەلی بـــێ باڵـــە لـــە ناوەنـــد دایـــە
ســـەبریش کـــە نـــەما ئێســـتە لـــە پەنجـــەی شـــێرم
ناچـــارم لـــە شـــوکری تـــۆ لـــە ئـــەم ســـەودایە

٥٥٢

شـــەو دێـــت و غـــەمت بـــارە، لـــە نـــاخم دایـــە
ئـــەم حەســـرەتە چەنـــد ســـاڵە لـــە ئـــاهم دایـــە
گریـــا دڵ لـــە بـــەر دەردم و ئـــەمجـــا پـــێم وت
ئـــەم بەزمـــە لـــە مێژ ســـاڵە لـــە کـــارم دایـــە

٥٥٣

یـــارەب، غـــەمی غـــەیری تـــۆ لـــە کـــارم دایـــە
بـــێ ســـوودی لـــە ســـوودی منـــە ئـــەم ســـەودایە
شـــەرمێ دەکـــەم بـــەم کـــارە لـــە دەرگـــاهی تـــۆ
پـــاکی کـــەوە ئـــەم نەنگـــە لـــە حـــاڵم دایـــە

٥٥٤

یـــارەب، غـــەمی غـــەیری تـــۆ کـــە لـــە دڵـــم دایـــە
پـــاکی کـــەوە وەک ســـیخە لـــە جـــەرگم دایـــە
پێویســـتە لـــە ســـەرمن هـــەموو دەم یـــادی تـــۆ
بـــۆ چاکـــە وو لـــوتفی تـــۆ کـــە لـــە ملـــم دایـــە

٥٥٥

دووبـــــارە ئـــــەوین هـــــات و لـــــە گیـــــانم دایـــــە
خاڵیمـــــە لـــــە خـــــۆم و لـــــە ڕەگـــــانم دایـــــە
بەنـــد بەنـــدی لەشـــم پـــاکی لـــە دەســـتی ئـــەو دا
نێـــو بانگـــە لـــە مـــن، ئـــەو لـــە ژیـــانم دایـــە

٥٥٦

شـــەو هاتـــەوە بـــۆ غـــەم، لـــە هـــەناوم دایـــە
گریـــانی بـــە خوێنـــاوی، لـــە نـــاخم دایـــە
لـــە خـــوێنی دڵـــم هـــەموو مژۆڵـــی چـــاوم
وەک ســـیخی کەبابـــە کـــە لـــە چـــاوم دایـــە

٥٥٧

بەحرێکـــە جیهـــان دایـــم لـــە مـــەوجان دایـــە
لـــەو مەوجـــە زیـــاتر چ وە چـــاوان نایـــە
بـــۆ مـــەردی دەروون خـــوێن، لـــە مـــەوج مەعلوومـــە
ئـــەو، ڕووکەشـــە، ئـــەم بـــەحرە لـــە مـــەوجان دایـــە

٥٥٨ ئیشارە بە (کن فیکون)

ئـــەم بوونـــە وەکـــوو بـــەحرە لـــە جیهـــان دایـــە
ئـــەمواجی بـــە خـــورڕ دێـــن نـــە لـــە وەســـتان دایـــە
عالـــــەم کـــــە پێشـــــاندەری خـــــورِی ئەمواجـــــە
بـــێ وەخـــت و زەمـــان، ئانـــە! لـــە یـــەک ئـــان دایـــە

٥٥٩

عالـــەم هـــەموو دەم لـــە خزمـــەتی ئـــەو دایـــە
عاقـــڵ بـــە گومـــان دوژمنـــە یـــا مەولایـــە
دەریـــا بـــە وجـــوود مـــەوجی لـــە زاتـــی دایـــە
خاشـــاک بـــە گومـــان شـــەڕی لەگـــەڵ ئـــەو دایـــە

٥٦٠

ئـــەو خوایـــە کـــە جیهـــانی لـــە دەســـتی دایـــە
دوو نیعمـــەتی پێـــداوی کـــە نرخـــی نایـــە
ئاکـــاری جـــوان، تـــا لـــە جـــەمع شـــیرین بـــێ
ڕوخســـاری جـــوان، هـــەموو حـــەزی تێدایـــە

٥٦١

سـەیریکە جیهـان ڕەمـزی لـە ڕازی دایـە
وەک ئـاوی ژیـان لـە بنجـی تـاری دایـە
ئافراندوویـە ئـەم ڕازە لـە دەریـا ماسـی
ئێسـتا ئـەوە دەریایـە لـە ماسـی دایـە

٥٦٢

زێڕینـە قژێـک هـەیقی لـە چـەنگی دایـە
شـیرینە دەمێـک شـەهدی لـە شـەکری دایـە
فەرماندەیـە فـەرمان لـە دەسـی ئـەو دایـە
کـاری دوو جیهـان تـەواو لـە دەسـتی دایـە

٥٦٣

خواجـە لـە غـەمی حوسـن و جـەماڵی دایـە
هۆشـی لـە گـوڵ و لالـە وو بـاغی دایـە
ئێمەینـە کـە سـووتاو لـە میـان تەجریـدین
هۆشـی مـە لـە، (لا إلــهَ إلاّ الله) یـە

٥٦٤

ژانـــی دڵـــی ئـــەم خەڵکـــە لـــە بـــوونی دایـــە
ئاسایشــــــی ئێمـــــە لـــــە نـــــەبوونی دایـــــە
تـــۆ بیکـــە بـــە ســـەرمایە قەناعـــەت ئـــەمڕۆ
عیـــزەت لـــە قەناعـــەت، نـــە زەبـــوونی دایـــە

٥٦٥

چـــەورایی بـــە تـــام لـــە گۆشـــتی کێـــوی دایـــە
خاویـــاری بـــە تـــام لـــە نـــاخی ماســـی دایـــە
نێچیـــری قـــەدی شـــاخ و خـــەدەنگی کـــوردان
یـــەک تیـــر و ســـێ نیشـــانم لـــە دەســـتی نایـــە

٥٦٦

خوانـــاس کـــە لـــە ڕازی مەعریفـــەت ئاگایـــە
هۆشـــی نـــە لـــە خـــۆی، لـــە خزمـــەتی اللە یـــە
بـــوونی خـــۆت بـــە لاوە نـــێ، ئـــەوی پەیـــدا کـــە
ئـــــەم واتەیـــــە، (لا إلـــــــــهَ إلاّ اللە) یـــــە

٥٦٧

دوور بوومەوە لێت و لە دەروون هەڵڵایە
ئاگر لە دڵم بەربوو هەناسەم نایە
ڕۆیشتم لە لای تۆ مەلی ڕووحم ماوە
بێ نامە لە تۆ نایەتەوە ئەولایە

٥٦٨

عالەم وەکوو چی؟ کەسێکی عەقڵی لایە
چۆمێکی ڕەوان، سەد لک و پۆپی تیایە
هەر جۆگە وو جۆبارێ کە تۆ دەیبینی
ڕازێکی نەهێنی لە دەروونی دایە

٥٦٩

واتا، کە لە ڕستێکی وەدەستت نایە
«واوێدەچێ» لەمپەرە، بە کەڵکت نایە
پێتخۆشە لە هۆکار و لە هۆ حاڵی بی
ئاماژە، ڕەها نەکەی نەجاتت نایە

٥٧٠

ڕازی قسەکانت لە دڵم دەرنایە
بۆم ناسمێ ئەم گەوهەرە بۆم دەرنایە
ترسم لەوەیە لە خەو بە زارم دابێ
چەندین شەوە لەو ترسە خەوم بۆ نایە

٥٧١

دڵخوازی دڵت سادە وەبەر دەس نایە
بێ سەرزەنشی دڕکی جەفا دەس نایە
پشکووتوو گوڵی سووری لکی ئاواتم
تا سەر نەخەمە تەختی زەوی، دەس نایە

٥٧٢

من بێ تۆ دەمێک سەبر و قەرارم نایە
چاکەی تۆ گەلێکە لە ژمارم نایە
گەر بێتە زمان لە سەر لەشم هەر موویەک
شوکرێک بۆ هەزارت لە تەوانم نایە

٥٧٣

ڕوخساری تۆ بێ پەردە لە دیتن نایە
پەردەش کە نەبێ بۆمە لە دیتن نایە
مادام کە ڕوخت لە ئەوجی پڕشەنگی بێ
ئەمجارە هەتا هەینە لە دیتن نایە

٥٧٤

لە وڵاتی ئەوین حەسانەوەت بۆ نایە
کەم بوون و زیاد بوون نە لە دەس تۆ دایە
بێ دەرد و بەڵا دێن و دەکەن دەرمانی
ئەم عەشقەیە تاوانە لە دڵ تۆ دایە

٥٧٥

خۆزیا وەکوو مەل، باڵ و پەڕێکم بوایە
ڕۆژانە لە تۆڕا خەبەرێکم بوایە
بێ باڵ و پەڕم ئێستە لە دوورت ماوم
ئەی خۆزگە بۆ دەرگات قەدەمێکم بوایە

٥٧٦

نەققاشـــی ڕوخـــت، لـــە تانـــە بـــێ پەروایـــە
جـــوانتر لـــەوە بـــی خـــەیاڵ لـــە دەســـتی نایـــە
ڕوخســـار و دەم و لێـــوی تـــۆ وەک گـــوڵ وایـــە
شـــیرینە وەکـــوو شـــەهدە حـــەزی تێدایـــە

٥٧٧

ئـەی ڕووت کـە لـە نـەرمی وەکـوو ڕووحـم وایـە
خۆزیـــا قـــەدەمت لـــە بـــانی چـــاوم بوایـــە
دوو دیـــدە کـــە ڕابـــێخم لـــە ژێـــر قـــاچی تـــۆ
ئەزیـــەت چ دەکـــەن قـــاچی خـــەیاڵت دوایـــە

٥٧٨

ئـــەی چـــاوی دڵـــم ســـەیرکە لـــەو دنیایـــە
بـــۆ کـــاری جیهـــان سەربەســـەری ســـەودایە
دانیشـــە لـــە گۆشـــەیەک لـــەم و لـــەو لادە
تـــەنیا بـــە دەمێـــک، ڕاحـــەتی تـــۆ لـــەو دایـــە

٥٧٩

دەردێکـــی لـــە مـــن گیـــان دەســـتێنێ ئەوەیـــە
عـــەشـــقێکی کـــە کـــەس، چـــاری نـــەزانێ ئەوەیـــە
چاوێـــک هـــەموو دەم خـــوێنی هـــەناوی لـــێ دێ
ئێســـتا کـــە بـــە ڕۆژ مۆتەکـــە، شـــەو دێ شـــەوەیە

٥٨٠

هێنـــدەی کـــە لـــە کـــۆڵانی مـــە، تـــار و پۆیـــە
هێنـــــدەی کـــــە درەختـــــی میوەیـــــە و لیمۆیـــــە
هێنـــــدەی کـــــە لـــــە ئاســـــمان زەقـــــن ئەســـــتێرە
لای ئێمـــــە هـــــەموو شـــــوکر و سپاســـــی تۆیـــــە

٥٨١

دڵ دایـــیم لـــە ســـەر عەهـــد و قـــەراری خۆیـــە
گیـــان بۆغـــەمی تـــۆ خـــەریکی کـــاری خۆیـــە
ئەســـــبابی منالأنەیـــــە گشـــــت کـــــاری مـــــن
تـــەنیا غـــەمی تـــۆ لـــە ســـەر قـــەراری خۆیـــە

٥٨٢

یەک دەنگی کوفر هۆی لە پەرێشانی مەیە
بوتخانە کە ئابادە لە وێرانی مەیە
ئەم دینە کە هیچ عەیبێ لە ئەو نابینی
هەر عەیبی هەبێ ئەو لە موسڵمانی مەیە

٥٨٣

وەک گوڵ بە گوڵاو، شۆراوە ڕوویێکت هەیە
وەک موشکی بە مەی کراوە موویێکت هەیە
ئەو ڕۆژە قیامەت دێ لە بەر زۆری خەڵک
پڕ ئافەت و میحنەت زەدە ماڵێکت هەیە

٥٨٤

ئەی شەم، تۆ نموونێکت لە سووتانم هەیە
حاڵێکت وەکوو حاڵی پەرێشانم هەیە
تۆ گەرچی لە سووتانی شەوم باخەبەری
ئاخۆ خەبەرت لە سۆزی ڕۆژانم هەیە؟

٥٨٥

تا کاتی نەیە وەعدەیی کارێ کە هەیە
قازانجی نییە کۆمەکی یارێ کە هەیە
تا زەحمەتی سەرما وو سەهۆڵان نەخوا
پڕ نابێ لە گوڵ دامەنی خارێ کە هەیە

٥٨٦

بێ شک بۆ هەموو دەردەکی دەرمانێ هەیە
بۆ عەشق بەیەقین بزانە گیانانێ هەیە
گەردوون کە هەموو دەم لە خول و سووڕانە
زانا، بە یەقین، دەزانێ گەردانێ هەیە

٥٨٧

ئێستا ئەوە دێم باری گوناهم پێیە
دەست خاڵی لە فەرمانم و شەرمم پێیە
ترسم لە عەداڵەت هەیە لای تۆ ئەمما
بەحری کەرەمت قووڵە ئومێدم پێیە

٥٨٨

دەی پرسـی کەسـێک، بێـژە ئـەوینت کێیـە
پـێم وت کـە فلانێکـە چ ئیشـت پێیـە
دانیشـت و بـە هـاوارەوە گریـا بـۆ مـن
دەسـت خـاڵی مـەڕۆ ڕێگـە کـەمینت ڕێیـە

٥٨٩

چـاوم هـەموو گریانـە ڕەقیـبم کێیـە
ناسـۆری غـەم و کۆنـە بـرینم پێیـە
هـاوارە لـەمن نـەماوە نیشـان، چیـە عیشـق
مـن بوومەتـە مەعشـووقە و عاشـق کێیـە

٥٩٠

بـی بەخشـە ئـەوەی بێجگـە لـە تـۆ یـاری نییـە
زیـاتر لـە غـەمی تـۆ نـەبی هیچکـاری نییـە
بـۆ یـادی تـۆ حاڵـەتێکی ئـاوای تێـدا
لای تـۆ بـێ و لای تـۆ نـەبێ ئـارامی نییـە

# پیتی (ی)

## ٥٩١

هەر ئان تۆ لە کار و دڵ و حاڵان ئاگای
بۆ حاڵی دڵی شکەستە باڵان شیفای
هاوار کە دەکەم لە ناخی سینەم ئەبیەی
زوانن کە نەبێ بە گفتی لاڵان زانای

٥٩٢

ئەو شۆخە لە سەر دیدە بوو دایم جێگای
ڕۆیشت و نەما، قامەت و قەددی ڕەعنای
فرمێسکی ڕژا دیدە لە تاوی گریا
هێندەی کە بلۆقی کرد لە ئەشکم ژێر پای

٥٩٣

گەر شەو بێ بەیانی لە خەوێ دا ڕابی
ڕۆژ هەڵنەیە فرمێسک لە چاوت دابی
هەڵواسە دڵت بە ئەو کە ناچاری لە ئەو
بۆ هەرچی کە مەیلی ئەوە تۆ ئاوا بی

٥٩٤

تا ڕۆژێ لە بوون، پاک و پەشیمان نابی
وەک عارف و مەستانی موسڵمان نابی
تا خەڵکی نەڵێن کافر و زەندیقی تۆ
بۆ ئەهلی دڵ و عاشق و مەستان نابی

٥٩٥

بــــێ نرخـــــە جیهــــان بـــۆ دەبــــێ ئـــــاڵۆزی بــــی
وەک نــــەی لــــە دەروون لــــە ناڵــــە وو ســــۆزی بــــی
ئــــەم هـــیچ و جیهـــان هـــیچ و غـــەم و شـــادی هـــیچ
ئــــەم هیچـــە چ بــــێ نرخــــە کــــە دڵ ســــۆزی بــــی

٥٩٦

ئـــــــازاری مـــــــەدە، دڵێکـــــــی تـــــۆ گیـــــانی بـــــی
هــــەر خـــــۆت بـــــە نــــــەهێنی دڵ و دڵـــــداری بـــــی
ترســـــــم لەوەیـــــــە لـــــــە کــــــاتی دڵ ئــــــــازاری
دڵ وەخـــــوێن گـــــەڕێت و تـــــۆ لــــە نێـــوانی بــــی

٥٩٧

پــــەیمان چ لــــە ســــەر زار و زمــــان هەڵبــــەســــتی
بــــەو یــــەک لــــە بوتــــانی دڵەکــــەت ناوەســــتی
وا بیـــــر مەکـــــەوە بـــــە یەک (شــــهادت) دەرچـــــی
ڕۆژانـــــە خومـــــاری لـــــە شـــــەوان سەرمەســـــتی

٥٩٨

بـــەو بـــەژنی بڵنـــد و خـــەمی زولفـــی پەســـتی
بـــەو نێرگـــزی پـــڕ خومـــار و بـــێ مـــەی مەســـتی
دەمبینـــی کـــە ڕۆژێـــک لـــە کلیســـا دەگـــەڕێم
ناقووســـم بـــە دەســـتێک و بـــە دەســـتێ «اســـتی[١]»

٥٩٩

زولفـــی تـــۆ بڵاوبـــۆوە لـــە دنیـــا گشـــتی
لارایـــەوە عـــەتراوی بـــە ســـەر دا ڕشـــتی
ئـــەی ئـــاگر هـــەتا ســـاردەوە بـــووی سووتا بـــووم
ئـــەی وای لـــە ئـــەم ڕۆژە گـــڕی دا گشـــتی

٦٠٠

دڵ پـــڕ لـــە کـــەچی و ڕووی لـــە ســـەر خـــاکی چـــی
دەشـــکێنێ دڵـــی هـــەر کـــەس و دڵپـــاکی چـــی
بـــە ڕواڵـــەت ئـــەتۆ پـــاکی لیباســـت جوانـــە
پـــڕ کینـــە بـــێ دڵ، ســـوژدە لـــە ســـەر خـــاکی چـــی

---

١ ـ وشەیەکی عەرەبیە، واتە: ئالەتی سێکس.

٦٠١

شـــیرکت لــــە دڵا بێـــت و دڵـــی پـــاکی چـــی
فیـــزت لــــە ســـەرا بێـــت و ســـەری خـــاکی چـــی
ژەهـــــراوە گونـــــاە، تۆبەیـــــە تریـــــاکی ئـــــەو
ئـــەم ژەهـــرە بـــە دڵ گەیشـــت و تریـــاکی چـــی

٦٠٢

ڕوو زەردی لــە ڕووی مــن بــوو کــە یەکســەر بــاری
لــەم چــاوە تــەڕەی مــن بــوو کــە ئــازەر بــاری
بــۆ ئــاوری ئــەوینی تــۆ ســەری خــۆم دانــا
لـــەم هـــەوری موحەببـــەتم ســـەمەندەر بـــاری

٦٠٣

یـــارەب، یـــارەب، کـــەریم و هـــەم غـــەففاری
ڕەحمـــــان و ڕەحـــــیم و ڕاحـــــیم و ســـــەتتاری
داوامـــــە بـــــە ڕەحمـــــەتی خوداوەنـــــدی خـــــۆت
ئـــەم بەندەیـــە شـــەرمەندە نەکـــەی یـــەکجاری

٦٠٤

دوور بوومـــــەوە لێـــت ئێســـتە لەبـــەر ناچـــاری
لای تۆیـــە دڵـــم هەمیشـــە لەوبـــەر دیـــاری
ژێـر سـایەیـی لـوتفی تـۆ لـە هـەر جێیـەک بـم
نێزیکـــە لـــە ســـەر مـــن کـــەرەمت گـــەر بـــاری

٦٠٥

گـــەر ڕاوی عـــەدەم بوویـــە لـــە خـــۆ ڕزگـــاری
گـــەر داخڵـــی خـــۆ بوویـــە غـــەم و ئـــازاری
هوشـــیاربە، وجـــوودت لەمپـــەری ڕێگایـــە
گێـــژ بوویـــە لەگـــەڵ خـــۆتی وەکـــوو پـــەرگاری

٦٠٦

لـەو جێیـە کـە تـۆ هـەی وەکـوو وەی نـەدیاری
هـەر جێیـە کـە تـۆ نـی لـە هـەموو کـەس دیـاری
خـــوایێکی زەریفـــی، وە چ شـــکڵێ نـــاچی
هـەر تـۆی کـە دەمێنـی بـۆ ئەبـەد یـەکجاری

٦٠٧

گەر تۆ سەرە ڕێی یار و لە داوی یاری

یاران ئەوە ڕۆیشتن و تۆ بێکاری

کەڵپۆسی بەرت سەوز و سپی یا ڕەش بێ

پێویستە بە دڵی سافی نەوەک لاساری

٦٠٨

تا دەست لە هەواو و لە هەوەس ڕانەگری

تا دەست لە منی و ڕووحی منی هەڵنەگری

ناگەی بە گوڵی سەر لکی ئاواتی تەمەن

گەر تۆ دەسەڵات بە سەر نەفس دانەگری

٦٠٩

نرخی نییە دنیا کە لە بەر ئەو بمری

مەردانە بژی لێی گەڕێ با ئەو بمری

ئەم هیچ و جیهان هیچ و غەم و شادی هیچ

ئەم هیچە چ بێ نرخە لە بەر ئەو بمری

٦١٠

تـــۆ دایـــم لـــە مـــن دڵ دەبـــەی و مـــەعزووری
قـــەت غـــەم، بـــە ســـەرت نـــەهاتووە مـــەعزووری
مـــن بـــێ تـــۆ ســـەدان ڕۆژە لـــە خوێنـــدا مـــاوم
تـــۆ بـــێ تـــۆ نـــەماوی شـــەوەکی مـــەعزووری

٦١١

هـــەر ڕۆژە بـــەیانی کەڵەشـــێری ســـەحەری
ئـــاوازی ســـەحەر چەنـــد خولـــەکی دێتـــە بـــەری
بـــۆ تـــۆ ئەمـــە نیشـــانە لـــە ئاوێنـــەی ڕۆژ
ڕۆژێـــک لـــە تەمـــەن تێپـــەڕی تـــۆ بـــێ خەبـــەری

٦١٢

بـــۆ خزمـــەتی حـــەق پەردەیـــە نـــووکی دەرزی
زۆرزانـــە کەســـێک، نـــەهێڵێ ڕووحـــی بـــڕزی
لایـــەک غـــەمی مـــاڵ لایـــەکی ئـــەولاد و ژن
خـــۆش ئـــەو دڵەیـــە لـــە ترســـی یـــاری لـــەرزی

٦١٣

ئـــەی دڵبـــەری عیســـا نەفەســـی قودســـی ژی
بـــێ نـــووری جـــەماڵی تـــۆ لـــە عالـــەم کـــێ ژی
پێمخۆشـــە کـــە فرمێســـک لـــە چـــاوم بســـڕی
بـــەم لێـــوی تـــەڕت لـــە لێـــوی ئیشـــکم بمـــژی

٦١٤

نێـــو بانگـــت هـــەبێ لـــە شـــاری «شَـــرُّ النَّـــاسِ»ی
گـــەر خانـــەنشـــین بوویـــە گـــەلێ وەسواســـی
وا چاکـــە وەکـــوو حـــەزرەتـــی خـــدر و ئـــەلیاس
نەیناســـی کەســـێ تاقـــە کەســـێ نەتناســـی

٦١٥

بـــایی بـــوون، چ قێزەونـــە لـــە مێشـــکت هەوەســـی
ناگـــەی بـــە چ شـــوێنێک و لـــە کـــارت دەوەســـی
وەک زولفـــی کچـــان چـــین و شـــکەن بنوێنـــە
ڕاکێشـــە دڵـــی هـــەر کـــەس و دەســـتت نەوەســـی

## ٦١٦

وەک تیشـــە مەبـــە هـــەمووی بـــەرە و خـــۆ تاشـــی
وەک ڕەنـــــدە مەبـــــە بـــــۆ دەرەوەی خــــۆ پاشــــی
زانســــــت لــــــە مشـــــار وەرگــــــرە بــــــۆ کــــــردارت
نیـــوەی بـــۆ خـــەڵک، نیـــوە بـــەرەو خـــۆ تاشـــی

## ٦١٧

عاشـــق بـــی دەبـــێ، تیـــغ لـــە ملـــت ڕاکێشـــی
دەردێـــک کـــە دەگـــا، وەکـــوو ژەهـــر بینۆشـــی
هـــەر چەنـــدی جگـــەر دێمـــە وو بـــێ ئـــاویش بـــێ
دەریـــــا دەریـــــا، خـــــوێنی جگـــــەر هەڵکێشـــــی

## ٦١٨

مـــــن عاشـــــق و پـــــەیمانی گیـــــانم بـــــاقی
خـــۆم ســـاقی ئـــەوین تـــا وەکـــوو گیـــانم بـــاقی
غـــــەم نۆقـــــڵ و نـــــەدیم دەردە و موتریـــــب ناڵـــــە
مـــن خـــوێنی جگـــەر دەخـــۆم و چـــاوم ســـاقی

٦١٩

ئـــەی خوایـــە تـــۆ هەڵوەشـــێنی هـــەر بەنـــدێکی
خـــاریجی لـــە ڕســـتەی، لـــە چییـــە و چەنـــدێکی
ئـــەم دەوڵەتـــە بـــۆم بـــەس کـــە ئـــەمن بەنـــدەی تـــۆم
ئـــــەم عیززەتـــــە بـــــۆم بـــــەس چ خوداوەنـــــدێکی

٦٢٠

پرســــیومە لـــە ئـــەو هـــۆ و ســـەبەبی هیجرانـــی
فـــەرمووی ســـەبەبی ڕەوشـــەنە گـــەر بیزانـــی
چـــاوی تـــۆ مـــنم چـــۆن تـــۆ دەبینـــی چـــاوت
گیـــانی تـــۆ مـــنم کـــەس هەیـــە دیبـــێ گیـــانی

٦٢١

ئـــەی دڵبـــەری عیســـا نەفەســـی نەســـڕانی
بـــۆ نایـــەوە لام تـــۆ کـــە تـــرس نـــازانی
پـــاکی کـــەوە لـــەم چـــاوە تـــەڕە ئەســـرینم
تاریـــک بـــووە لـــەش بێنـــەوە جەســـتەم گیـــانی

## ٦٢٢

کـــەم ڕوحمـــی و کـــەم لـــوتفی لـــەتۆ دەمزانـــی
بـــێ دەرد و ســـتەم عـــادەتی تـــۆ دەمزانـــی
هـــەر جـــەور و جەفایـــە عـــادەتی یـــاری مـــن
مـــن عـــادەتی ئـــەو یـــارە لـــە زوو دەمزانـــی

## ٦٢٣

دوێنـــێ بـــوو لـــە شـــەی دابـــوو خـــەمی زولفـــانی
بـــەو پەرچەمـــە شـــاردیەوە تـــەلاری جـــوانی
پرســـیم چیـــە شـــەو هاتـــەوە وتیـــان نـــابێ
نامـــەحرەم و بێگانـــە ببینـــێ ڕووانـــی

## ٦٢٤

خـۆ چـووک و بـە کـەم مەزانـە، کاـ نـی، کـانی
وەک سـەوزە نـی بڕوێیـەوە، گیاـ نـی، گیـانی
بەرپرســـی لـــە کـــار و کـــردەوە و ئاکـــارت
هوشـیار بـە بـرا، تـۆ کـە نـە جـانی، جـانی

٦٢٥

تــا تــۆ لــە دوای گەوهــەری کــانی، کــا ـــ نــی
مــادام کــە لــە دوای لوقمــەیێ نــانی، نــا ـــ نــی
هەوســـــاری ژیـــــان لـــــە دەســـــتی مـــــەردێکی دا
ئەوکـــەس بـــە هـــەل و مـــەرجی زەمـــانی زانـــی

٦٢٦

گــەر تـــۆ لــە شــەوی زەنگـــی و ســـەر ســـوڕمانی
پێتخۆشـــــە ڕەهـــــابی لـــــە خـــــەوی نـــــەمزانی
ڕاســـتی بکـــە ســـەرمایـــە بـــە ڕاســـتی ڕاســـتی
شایســـــتەیە بـــــۆ لوتـــــف و (صـــــفا)ی یـــــەزدانی

٦٢٧

نــە مــن مــنم و، نــە تــۆ ئــەتۆ، نــە تــۆ منــی
هــەم مــن مــنم و، هــەم تــۆ ئــەتۆ، هــەم تــۆ منــی
مــن وامــە لــەگــەڵ تــۆ ئــەی نیگــاری کــوردی
پــێم وا هەڵــەمــە، کــە مــن ئــەتۆم، یــا تــۆ منــی

## ٦٢٨

مەیـــدانت بـــەرین و مــــەردی مەیـــدان، بـــۆ نـــی؟
مــــەردێکی بـــە ناوبـــانگی لـــە جیهـــان، تـــۆ نـــی؟
ژێـــر پـــەردە ئـــەوەی کـــە نـــابێ بیکـــەی، دەیکـــەی
پۆشـــیوتە عـــەبا بـــۆچی؟ موســـڵمان بـــۆ نـــی؟

## ٦٢٩

ئـــەی خـــالقی بـــێ وێنـــە وو مـــەعبوودی غـــەنی
ئـــەی ڕۆزی دەری تـــەواوی دەروێـــش و غـــەنی
قـــەرزم لـــە خەزێنـــەی کـــەڕەمت بـــۆ بـــدەوە
هـــەر خـــۆت بـــە کـــەڕەم لـــە بەنـــدەگان بمکـــە غـــەنی

## ٦٣٠

ئـــەی عـــەشـــقی تـــۆ ســـووتێنەرە وەک ســـووتەمەنی
ئیبـــڕاهیم لـــە ئـــاگر، بـــە ئـــەوین پێدەکـــەنی
تاکـــەنگێ لـــە تـــاوی تـــۆ بســـووتێم لێـــرە
زوو بمبـــەوە، ئـــەم خەڵکـــە بـــە مـــن پێدەکـــەنی

٦٣١

ئـــەی دڵ تـــۆ ئەگـــەر دڵبـــەری وەک خـــۆ بینـــی
زەڕڕاتـــی جیهـــان، چـــی هـــەیـــە وەک خـــۆ بینـــی
تـــۆ ئاوێنـــە بـــە بـــەڵکـــوو لـــە خـــۆ بیبینـــی
بـــۆ ئاوێنـــە مـــەڕوانـــە نـــەوەک خـــۆ بینـــی

٦٣٢

ئـــەمجـــا وەرە تـــا مـــەســـتی نیـــازم بینـــی
شـــەوگاری شـــەوان ڕاز و نیـــازم بینـــی
نـــا نـــا، هەڵـــەمـــە دووری لـــە تـــۆ دڵـــدارم
نـــاهێڵێ بمێـــنم کـــە لـــە ڕازم بینـــی

٦٣٣

مـــن لـــە ســـادەگی و فـــەقیری و مســـکینی
تـــۆ لـــە سەرکەشـــی و بڵنـــدی و خـــۆبینی
گـــەر تـــۆ لـــە ســـەر ئـــاگرم بخـــەی دانیشـــم
مـــن تـــۆ لـــە ســـەری دیـــدە دەنـــێم بمبینـــی

٦٣٤

لـــەو مەکتەبـــە گـــەر بێـــی و دەرس بخـــوێنی
زانـــا بـــی لـــە نـــاو کـــۆڕ و ســـەرت هـــەڵبێنی
بـــۆ باســـی ئـــەوین تـــۆ بـــە هـــەموو زانســـتت
وەک تفلّـــــی دەبســـــتانی هـــــەوێنیَ دێنـــــی

٦٣٥

بـــۆ خـــەڵکی زەمـــان، ســـەیرە کـــە دەســـت دەنـــوێنی
بـــۆ کـــونجێ بـــڕۆ حـــەیفـــە ســـەرت هـــەڵبێنـــی
داوا لـــە کەســـێ دەکـــەی کـــە هـــەر وەک تۆیـــە
چـــارت ئەوەیـــە دەســـت لـــە خـــودا هـــەڵبێنی

٦٣٦

گـــەر ڕاوی فـــەنا بوویـــە، وەکـــوو خـــۆ مـــاوی
گـــەر داخڵـــی خـــۆ بوویـــە، لـــە دەس خـــۆ مـــاوی
وەبزانـــــــە وجـــــــوودت لەمپـــــــەری ڕێگایـــــــە
دانیشـــتی بـــە تـــەنیا، نـــەوەکوو خـــۆ مـــاوی

٦٣٧

(اللە) هەر ئەتۆی و لە دڵ ئاگا هەر تۆی
دواکەوتوو منم نوێنەری ڕێگا هەر تۆی
مێروولە ئەگەر لە ژێر زەوی ناڵەی بێ
فەریا ڕەسی ئەو تۆی و بە ئاگا هەر تۆی

٦٣٨

ئەی ئەو کە لە پاشایی بمێنی هەر تۆی
نوێنەر لە شەوو کاری بەیانی هەر تۆی
کاری منی بێچارە بە دەستی تۆیە
بۆ من لە دوو جیهان کە بمێنی هەر تۆی

٦٣٩

نوسراوەیی نامەیی خودایی هەر تۆی
ئاوێنەیی ئەفرانی جوانی هەر تۆی
مەوجوودە لە تۆ هەرچی لە عالەم دایە
بۆ خۆت بگەڕێ، ون بوو لە عالەم هەر تۆی

٦٤٠

«سبحانک» بۆ دەرد و غەمم یارم تۆی
«سبحانک» بۆ کوێرەگرێی کارم تۆی
«سبحان الله» بە ئەمری تۆ «کن فیکون»
«سبحان الله» غەفوور و غەففارم تۆی

٦٤١

بۆ دڵبەری دڵ، مەگەر گیانت نابەی
دەست خاڵی دەڕۆی شەرمێ لە کارت ناکەی
بێ ناڵە وو بێ دەردی سەرم سوورماوە
شەرمێ نە لە خۆت، لە کردگارت ناکەی

٦٤٢

زیاتر لە گیان دڵ، بۆ گیانان نابەی
دەردت پێبدەن نێوێ لە دەرمان نابەی
بێ دەردی لە ئێستاوە لە دەرد ناڵەت دێ
شەرمە، بەسە، ئابڕووی دەردەداران نابەی

٦٤٣

دەمبەی بۆ سەری جۆگە وو ئاوم نادەی
«لاحول»ە دەڵێی ڕەشمە لە چاوم لادەی
بۆمە بە ستەم دەستی تۆ چەند ئازادە
بۆ؟ تۆ گەزمەی نیوەشەوی کام جادەی

٦٤٤

یارەب، لە قەناعەت سەر و سامانم دەی
تاریک بووە دڵ، هاتوومە دەرمانم کەی
ڕۆزی منی سووتاوی غەم و دەردی تۆ
بێ منەت لە خەڵک هەر تۆ لە گیرفانم خەی

٦٤٥

ئەی وە خوێن گەڕێی دڵ وەرە سەبرت تاکەی
ئەی گیان وەرە دەر نایەم و نازت تاکەی
ئەی دیدە چ نامەردی خەجاڵەت نابی
یارت کە نەدی سەیری جیهانت تاکەی

٦٤٦

تـــەعریفی لـــە دڵ لـــە لای حەســـوودان تاکـــەی
پـــڕ قیمەتـــە کـــاڵای تـــۆ لـــە بـــەریان ناکـــەی
تـــۆ خـــۆت کـــە نـــەبووی خـــەیاڵی بـــوون مەفرۆشـــە
بـــێ نرخـــی دەکـــەی، خـــەیاڵی خامـــان تاکـــەی

٦٤٧

ئـــەی دڵ، لـــە شـــەڕابی جـــەهل، مەســـتی تاکـــەی
ئـــەی خانـــە خـــەراب، لافـــی هـــەبوونی تاکـــەی
گـــەر غـــەرق نـــەبووی لـــە بـــەحری نـــاز و مەســـتی
داوێنـــــی تـــــەڕ و هـــــەوا پەرەســـــتی تاکـــــەی

٦٤٨

یـــــاقووتم لـــــە دوو دیـــــدە دەڕێـــــژی تاکـــــەی
وەک کێـــوی غـــــەمم خـــــۆڵم دەپێـــژی تاکـــــەی
بـــۆ هـــەرچی لـــە تـــۆ پـــەنا بـــەرم بـــێ ســـوودە
هـــەر دێمـــە پـــەنای تـــۆوە، لـــەوم دەرناکـــەی

٦٤٩

ئـــەی ئـــەو کـــە لـــە ئاســـمان هـــەور ڕێژاکـــەی
لوتـــف و کـــەڕەمت، لـــە گـــاوریش ڕاناکـــەی
نوێژگـــەی تـــۆ کـــە وێـــران بـــووە خانـــەی تۆیـــە
ئـــەی خانـــە خـــەراب ســـەبر و تەماشـــا تاکـــەی

٦٥٠

گـــەر وێنـــەی خـــەلیل کەعبەیـــەکی ئـــاوا کـــەی
ئـــەم کەعبـــە بـــە نـــوێژ و بەنـــدەگی ئـــارا کـــەی
ڕۆژانـــــە ســـــەدان بەنـــــدە لـــــە بەنـــــدی لادەی
زۆر باشـــە ئەگـــەر غـــەم لـــە هـــەژارێ ڕاکـــەی

٦٥١

یـــاڕەب، لـــە تـــەواوی کـــەڕەمت خاســـم کـــەی
هوشـــیاری بـــە کـــردەوە و خوداناســـم کـــەی
لـــــەم عەقڵـــــە جـــــەفاکارە ســـــەرم شـــــێواوە
دێوانـــەیی خـــۆتم کـــەی و ڕزگـــارم کـــەی

٦٥٢

یـــا ڕەب نەیـــە ئـــەو ڕۆژە لـــە دەرکـــانم کـــەی
موحتـــاج بـــە کـــەس و ناکـــەس و خزمـــانم کـــەی
مـــوویی ڕەشـــی مـــن بـــە ئـــەمری تـــۆ چـــەرمووگـــە
بـــــەم مـــــوویی ســـــپی تـــــازە پەرێشـــــانم کـــــەی

٦٥٣

تـــۆ دایـــم لـــە کـــۆ دای و بـــە تـــاکی ناگـــەی
مـــادام کـــە لـــە خـــۆ دابـــی بـــە مـــەردی ناگـــەی
تـــا ڕۆژێ لـــە ڕێگـــا بـــێ ســـەروپێ، نـــەکرێی
بـــێ دەرد کـــــە دەمێنـــــی، بـــــە چ دەردێ ناگـــــەی

٦٥٤

پـــێم وت کـــە تـــۆ کێـــی؟ بـــۆچی ئـــەوا ڕەعنـــایی
فـــەرمووی کـــە مـــنم بـــە ســـیفەتی یـــەکتایی
هـــەم عـــەشـــقم و هـــەم عاشـــق و هـــەم مەعشـــووقم
نـــــەینووکی جـــــەماڵم هونـــــەری بینـــــایی

## ٦٥٥

تا چەندە قسان بەم و بە ئەودا، داوێی
بێوەی هەدەفت بپێکی، هەر دەی هاوێی
نەتخوێندوە پەڕێک، لە باسی بێ دەنگیدا
هەر بۆیە زمان شل دەکەی و دەی هاوێی

## ٦٥٦

ئەو دڵ کە هەبوو لە خوێن شەڵاڵ بوو، ڕۆیی
چاوم سەرە ڕێ، لە خوێن غەرق بوو، ڕۆیی
ڕۆژێک بە هەوای عاشقی لەم گوڵزارە
لەیلایەکی دی، شێتی ئەوی بوو، ڕۆیی

❋❋❋❋❋

# پیتی (ی)

٦٥٧

پیر بوومە بەڵام ئەوین لە گەڵ من دابێ
شادیی و (نشاط) و تەڕەب و سەودا بێ
لەم زولفە درێژەی تۆ کەمەندێ بادەم
دەیخەم لە ملی تەمەن ، لەگەڵ من ڕابێ

٦٥٨

هـیچ کـەس نیـە لـە ئـەو جێیـە کـە تـۆی تێدا بـێ
هــەر جێیــە کــە تــۆی لــێ نــەبی غــەیرت نــابێ
دێــــی دڵ دەبـــەی و مەبەســــتی دڵ دەخــــوازی
یــــارەب، چ خـــوداییێکی کــــە وێنــــەت نــــابێ

٦٥٩

ئـــەم عـــەشـــقە نـــە حاڵێکـــە بـــە ســـەر زارا بـــێ
پـــڕ قیمەتـــە ئـــەم گەوهـــەرە پەیـــدا نـــابێ
ســـەودایەکە چەنـــد ســـاڵە لـــە نـــاخم دایـــە
ناســـوفتەیە کـــون کـــراوی پەیـــدا نـــابێ

٦٦٠

تـــا لـــەعلی تـــۆ ئـــاوا لـــە دڵـــم کـــارا بـــێ
کـــارم هـــەموودەم، ئـــاه و غـــەم و ســـەودا بـــێ
دەتفـــەرموو کـــە مـــن دێمـــەوە میوانـــت بـــم
ئـــەی خوزگـــە بـــە یـــەکجاری و بـــێ مـــەودا بـــێ

٦٦١

عـــارف لـــە دەروون گـــەرچی پـــڕ و ئاگـــا بـــێ
بـــۆ دامـــەنی قودســـی تـــۆ لـــە ڕێگـــا دابـــێ
خـــاوەن نـــەزەر و دەســـتی بڵنـــدی لابـــێ
بـــۆ دامـــەنی ئیـــدڕاکی تـــۆ واڵا نـــابێ

٦٦٢

عاشــق کــە غــەمی بــۆ هــەموو کــەس واڵا بــێ
کۆبوونەوەکـــەی تەفرەقـــەیی کـــاڵا بـــێ
شـــادی لـــە دڵـــی نـــابێ هـــەتا ئـــەو مـــابێ
پێموایـــە زەماوەنـــدی دەمـــی کۆتـــا بـــێ

٦٦٣

هـــەر کـــەس هەوەســـی جـــاه و مـــەقامی لا بـــێ
بـــۆ هـــەر دوو جیهـــان ژینـــی لـــە شـــادی نـــابێ
بـــۆ بەنـــدەگی گـــەر بێـــت و ســـەری خـــۆی دانـــێ
بـــۆ ڕۆژی قیامـــەت غـــەمی کـــاری نـــابێ

٦٦٤

هەر جێیە کە تۆ هەی، ئەسەری غەم نابێ
ئەو جێیە کە نی، شادی لە سەر دڵ نابێ
ئەو کەس کە لە تاوی تۆ دڵی پڕ خوێنە
شادی گەلەکە، تاکوو ئەبەد کەم نابێ

٦٦٥

هەر کەس کە لە دەرگاهت لە مەیدانا بێ
بۆ کەعبە وو مزگەوت و کلیسا نابێ
گەر پەرچەمت لەم کەعبە خشێنێ دامەن
ئەم دینە بە دەست و پێ لە زننارا بێ

٦٦٦

خۆبینی بەسە، مەعریفەتت لا نابێ
کەی جارێکی مستت لە غرورت دابێ
ئەو فەقری کە مستەفا بە ئەو فەخری کرد
پێی ناگەی هەتا خوێنی دڵت نەڕژا بێ

## ٦٦٧

هــــەرگیز دڵەکــــەم لــــە تـــۆ تـــــەوەللا نــــابێ
گیـــانیش کـــە بچـــێ قـــەت لـــە دڵـــم لانـــاچێ
وێنـــەت کـــە لـــە نـــەینووکی دڵـــی مـــن دایـــە
ئـــەم وێنـــە بـــە تـــۆ نـــەبێ، بەکـــەس لانـــاچێ

## ٦٦٨

مەعشــــووقەیی خانـــەگی لـــە بـــۆ دەس نـــابێ
قـــەت نابـــا دڵ و ڕوویـــی لـــە هیچکـــەس نـــابێ
مەعشــــووقە دەبـــێ مەســـت و خـــەراباتی بـــێ
تـــا نیوەشـــەوان لـــە خوێنـــدن و ڕەقســـا بـــێ

## ٦٦٩

عاشــق بــە کەســێ دەڵــێن: کــە بــێ غــەم نــابێ
بــێ یــار و دیــار بــوونی لــە بــۆ غــەم نــابێ
دوور بــوون و جیــا بــوونی لــە یــاری ســەختە
عاشــق ئــەوە گــەر گیــانی لــە ڕێــی غــەم دابــێ

٦٧٠

بێ تاعەتی حەق بەهەشت بە ماچان نابێ
بێ خاتەمی دین ملڵکی سولەیمان نابێ
گەر نرخی وجوودت لە جیهان دەخوازی
بێ خزمەتی ئینسان و موسڵمان نابێ

٦٧١

ئەو ئەمن و ئەمانەی تۆ بە ئاسان نابێ
ئەم شەربەتە شیرینە بە ماچان نابێ
ئەو مەی کە عەزیزی ئارەزومەندانە
جورعێکی بە سەد ڕووح و بە سەد گیان نابێ

٦٧٢

عاشق بە یەقین وایە موسڵمان نابێ
بۆ مەزهەبی عاشق، سەر و ئیمان نابێ
بۆ ئەو دڵ و عەقڵ و لەش و گیانی نابێ
عاشق ئەوەیە بۆیە کە نادان نابێ

## ٦٧٣

عـــــومرێکی وەکـــــوو هـــــەوری بـــــەهاران وابـــــێ
چـــــاوێکی لـــــە گریـــــان وەکـــــوو بـــــاران وابـــــێ
ئـــەی کاکـــە ئـــەوا بـــژی کـــە لـــە دوای مـــەرگت
گۆســـتی گـــەزتراو، بـــۆ تـــۆ بـــە یـــاران مـــابێ

## ٦٧٤

پێـــت خۆشـــە کـــە تـــۆ دەوڵـــەتی ئـــەبڕاڕت بـــێ
نـــابێ لـــە بۆکـــەس، زەڕڕەیـــێ ئـــازارت بـــێ
ترســـت لـــە مـــەرگ بـــۆچی، غـــەمی ڕزقـــت بـــۆ؟
شـــەڕیانە لـــە ســـەر نۆبـــە، گـــەر ئارامـــت بـــێ

## ٦٧٥

دینـــدارە کەســـێک دینـــی لـــە ڕووی زانســـت بـــێ
جـــوابی بـــۆ هـــەموو کـــوێرەگرێ بـــەر دەســـت بـــێ
زانســـتی ئـــەزەل هـــۆ و ســـەبەبی ســـووچت بـــێ
کـــەم عەقڵییـــە ئـــەم بیـــرە، نـــەوەک زانســـت بـــێ

٦٧٦

شەو دەستم کەوێ ژوانی تۆ یارم ڕەنگ بێ
بە درێژی شەوم کورت و بە پانی تەنگ بێ
ئەو شەو کە لەگەڵ من لە شەڕ و ناسازی
شەو کوێر و درێژ و ڕەنگە پەروین لەنگ بێ

٦٧٧

تا کەنگێ لە دەس غەم، غەم و ئازارم بێ
غەم گشتی نەسیبی چەرخی ڕۆژگارم بێ
ئەی خوایە تەمەن بە قەدری غەم بارم بێ
یا کەم بێ غەمم، بە قەدری ڕۆژگارم بێ

٦٧٨

ڕۆژێکی ئەگەر وەعدە لەگەڵ یارم بێ
با تەوقی سەرم تا قەدەمم چاوم بێ
با من بە هەزار دیدەوە ڕێگا تەڕ کەم
تا بەڵکوو لە ڕووی لوتفەوە کڕیارم بێ

٦٧٩

پێتوانـــەبێ مـــن لـــە دوو جیهـــان ترســـم بـــێ
بـــۆ مـــردن و کـــاتی ئەجـــەلم ترســـم بـــێ
مـــردن حەقـــە خـــۆ نـــابێ لـــە ترســـی بمـــرم
گـــەر خـــۆ نەپەرەســـتم لـــە چ ڕا ترســـم بـــێ

٦٨٠

یـــاڕەب، نەیـــە ڕۆژێکـــی کـــە حیرمـــانم بـــێ
نیـــازم نـــە بـــە خـــەڵکان و نـــە خزمـــانم بـــێ
بـــێ منـــەت لـــە هـــەموو بەندەیـــەکی بمژێنـــی
نـــەک پـــێ و قـــەدەمی دەرکـــی گـــەدا و خـــانم بـــێ

٦٨١

ملکـــی تـــۆ لـــە ئیلامـــەوە تـــا مێـــردین بـــێ
چینیشـــی لەگـــەڵ بێـــت و هـــەتا مـــاچین بـــێ
ڕۆژێـــک دێ بـــە ناچـــاری دەبـــێ بـــاری کـــەی
پێـــت وانـــەبێ حـــەتتا کەفـــەنت، دابـــین بـــێ

٦٨٢

گـەر کـاری تـۆ چـاک بێـت و لـە دەسـتی تـۆ بـێ
گـــەر بێـــت و خـــراپیش بـــێ گونـــاهی تـــۆ بـــێ
تەســـلیم بـــە و ڕازی بـــە و هـــەر ســـادە بـــژی
خـــۆ کـــاری جیهـــان نـــابێ بـــە دەســـتی تـــۆ بـــێ

٦٨٣

بـۆ سـبەی کـە زەوالـی شـەش و مـەرگی تـۆ بـێ
قـــەدرت بـــە قـــەبارەی ئاشـــنایی تـــۆ بـــێ
بـــۆ جـــوانی خـــدەت، هەوڵـــدە بـــۆ دوا ڕۆژت
حەشـــری تـــۆ بـــە میزانـــی ســـیفاتی تـــۆ بـــێ

٦٨٤

یـــاڕەب گـــەر نـــەجاتم دەی لـــە نائومێـــدی چ دەبـــێ
ڕێگـــەم پـــێ بـــدەی دڵ تـــۆ بناســـێ چ دەبـــێ
گـــاورت بـــە کـــەڕەم گشـــتی موســـڵمان کـــردن
گـــاورێکی تـــریش گـــەر تـــۆ بناســـێ چ دەبـــێ

٦٨٥

قـــەت ئـــەو قســـە ناكـــا كەســـەكی عـــەقڵی هـــەبـــێ
گـــەر جـــوابی قســـەی ســـادە لـــە ژێـــر دەســـتی هـــەبـــێ
زانســـــــتی ئـــــــەزەل كـــــــەی ســـــــەبەبی تاوانـــــــە
كـــەم عەقڵیـــە ئـــەم عەقڵـــە ئەگـــەر عـــەقڵی هـــەبـــێ

٦٨٦

ڕوومـــەت گـــوڵ و لێـــو ئـــاڵێ ئەگـــەر لێـــرە هـــەبێ
چـــەپ گـــەردی فەلـــەك نایـــەڵێ ئـــەو یەكســـەرە بـــێ
بـــــۆ هـــــەردوو جیهـــــان دڵـــــت بـــــە دڵـــــداریێ بـــــدە
هـــەر بـــووە لـــە ئـــەزەل، بـــۆ ئەبـــەد و یەكســـەرە بـــێ

٦٨٧

ئـــەم عـــەشـــقە چییـــە شـــێری لـــە چـــەنگی دادێ
بـــۆ هـــەرچی گومانـــت بـــێ لـــە چـــەنگی ڕادێ
ئەوكاتـــە كـــە دوژمنتـــە دڵـــت بـــەو خۆشـــە
عاشـــق كـــە دەبـــی، خـــوێنی لـــە چـــەنگی ڕادێ

٦٨٨

یـــادت کـــە دەکـــەم ئـــەم دڵـــە هـــاواری دێ
نـــاوت کـــە دەبـــەم ناڵـــە بـــە یـــەکجاری دێ
هـــەرجارە کـــە نـــاوی تـــۆ لـــە ســـەر زارم دێ
خانـــــە و دەر و دیـــــوارە کـــــە هـــــاواری دێ

٦٨٩

زولفـــی ڕەشـــی تـــۆ یـــادی شـــەوانی لـــێ دێ
وەک چـــەنگی هـــەڵۆ خـــوێنی دڵانـــی لـــێ دێ
گـــەر پـــێچ و خـــەمی پەرچـــەمی تـــۆ واڵا کـــەم
بـــۆ عالـــەمی گیـــان بـــۆنی گـــوڵانی لـــێ دێ

٦٩٠

ئـــەی دڵ لـــە فیـــڕاق، گـــەر تـــۆ ڕەگیشـــت ببـــڕێ
نیشـــان بـــە کەســـی نـــەدەی سەریشـــت ببـــڕێ
ســـوتمانی لەشـــت وەکـــوو ڕەژی بـــێ دووکـــەڵ
ناڵـــەت لـــە دەروون دابـــێ دڵیشـــت بگـــرێ

## ٦٩١

دڵ لای تـــــۆ ژیـــــانی ئەبـــــەدی پـــــێ دەدرێ
غـــەم بـــۆ غـــەمی تـــۆ شـــادی دڵـــی پـــێ دەدرێ
ئـــــەم بایـــــە ببـــــا لـــــە خـــــاکی تـــــۆ بـــــۆ دۆزەخ
دۆزەخ شـــــەرەفی ئـــــاوی بـــــەقای پـــــێ دەدرێ

## ٦٩٢

تـــا دەســـت لـــە هـــەوا وو لـــە هـــەوەس لا نـــەدرێ
تـــا دڵ وەکـــوو دوڕ لـــە نـــاو ســـەدەف دانـــەنرێ
قـــەت کاســـە ســـەری پـــڕ لـــە هـــەوەس پـــڕ نـــابێ
وەک جـــامی ســـەرەوبن ئـــەوە، مـــەی ڕا نـــەگـــرێ

## ٦٩٣

ئـــەم ڕشـــتە لـــە دەســـتی تـــۆ لـــە لێـــوم بســـڕێ
لـــەو شـــەکری دەمـــت تـــۆزێ لـــە لێـــوم بـــدرێ
مـــــاوەی خولـــــەکی لـــــە باوەشـــــی تـــــۆ دابـــــم
شەشـــدانگی جیهـــان ئـــەدەم، لـــە نێـــوم بســـڕێ

٦٩٤

ئـــەی خوزگـــە ئـــەوین ڕۆژێ لـــە مـــن دڵ بکـــڕێ
کـــــارێکی بکـــــەم پـــــەردە لـــــە دڵ لابـــــدرێ
بەرماڵـــــە ڕزیوەکـــــەم بـــــە جـــــۆرێ ئـــــەدڕم
زننـــاری لـــە هـــەر پۆیـــەک و ڕایـــەڵ بکـــرێ

٦٩٥

لـــەو جـــێ کـــە غـــەمی ئـــەوین، لـــە نـــاو دڵ دەکـــرێ
بـــا تیغـــی ئـــەوین لـــەو دڵـــە (بەســـمەل) بکـــرێ
ژێرخـــــاک دەکـــــرێ ڕۆژێ ڕوخـــــی خوێنـــــاوی
هەڵدەســـتێ بـــە خـــوێن دامـــەنی قاتـــڵ دەگـــرێ

٦٩٦

پرســـیار لـــە گونـــاه وو لـــە هـــەڵـــەی تـــۆ دەکـــرێ
پرســـیاری هـــەڵـــەی تـــۆ نـــە لـــە مـــن، تـــۆ دەکـــرێ
دڵپـــاکی و هیـــوا لـــە دڵـــت گـــەر مـــابێ
ئـــەو خـــاوەنـــی هیوایـــە و لای تـــۆ دەگـــرێ

٦٩٧

تـــــا مەدرەســـــە وو منـــــارە وێـــــران نـــــەکرێ
تـــا کـــاری هـــەژاران ســـەر و ســـامان نـــەگرێ
تـــا ڕیشـــی ڕیـــا لـــووس و لـــە بـــن دا نـــەبڕێ
کـــوا تـــازە کەســـێک تـــازە موســـڵمان دەکـــرێ

٦٩٨

عاشـــق کـــە لـــە ڕێـــی عاشـــقی بـــێ ســـەر نـــەکرێ
یـــا هۆشـــی لـــە ڕێـــی عـــەشـــقی لـــە ســـەر دەرنـــەکرێ
هـــەم یـــاری بخـــوازێ هـــەم ســـەری بخـــوازێ
دەخـــوازێ بـــەڵام چـــۆنی لـــە بـــۆ ســـەردەگرێ

٦٩٩

خوانـــاس لـــە ئـــەوا ڕۆژێ کـــەنارێ دەگـــرێ
یـــا دامـــەنی کێـــو و لالـــەزارێ دەگـــرێ
لـــەم گۆشـــەیی مەیخانـــە دەچـــێ بـــۆ کـــونجێ
تـــا عالـــەمی ناپوختـــە قـــەرارێ بگـــرێ

٧٠٠

تۆبەم کە هەبوو پێمی شکاند ڕۆژی بەرێ
تۆبەم کە شکاند، بە تۆبە دەمبا بۆ سەرێ
وا ئێستە لغاوی من لە چەنگی ئەو دا
ساتێکی بە ساغ نایەڵێ تا بێمە دەرێ

٧٠١

تا دەوری ڕوخت سونبولی لێ هاتە دەرێ
سەد ناڵە لە من بولبولی لێ هاتە دەرێ
من دیومە لە گوڵ سەوزە سەری دەردێنێ
ئەمجارە چ بوو لە سەوزە گوڵ هاتە دەرێ

٧٠٢

بێ خەش کە دڵت کە حەق لە دوای ئەودەگەڕێ
ئەو دڵ کە خەشاوی بێ لە دۆزەخ دەگەڕێ
دیندار کە دڵی لە بەر خودا بێ خەش کا
گۆیێک لە دەستی ئەمە کەی دێتە دەرێ

٧٠٣

مــن‌زینــدووکەسـێک بێــت ولــە ڕووی تــۆ وەگــەڕێ
یــا مــەل لــە هــەوا لــە بارەگــەی تــۆ بگــەڕێ
ئێســـقانی لەشـــم بشـــکێ لـــە چـــاوی ئەوکـــەس
دوای مردنـــی مـــن بێـــت و لـــە ڕووی تـــۆ وەگـــەڕێ

٧٠٠

ئـــەی خـــالقی بـــێ چـــوونی هـــەموو بوونـــەوەرێ
ئـــەی ڕێبـــەر و ڕێنمـــایی هـــەر جانـــەوەرێ
پشـــتبەنـــدی ئومێـــدم بـــە تـــەمای تـــۆ بەســـتوە
ڕێـــم پـــێ بـــدە نیمـــە لەمـــە زیـــاتر هونـــەرێ

٧٠٤

زانـــا هونـــەران یـــەک بـــە ســـەدان دەژمێـــرێ
گـــەوجیش بـــە دەوام عـــەیبی جیهـــان دەژمێـــرێ
وەک پێـــوەری ســـوڵتانە شـــعووری گشـــتی
پێـــوەر هونـــەر و کـــاری جـــوان دەژمێـــرێ

٧٠٥

دڵـــــداری مـــــن گــــەر جـــارێکی دڵ بخـــوازێ

ڕۆژانـــــــی ژوانـــــــی ســـــەر و دڵ بخـــــوازێ

(مقصـــــود) و مەبەســــتم لـــە ئـــەوینت (وصـــــلە)

ئـــاخۆ تـــۆ بڵێـــی وابـــێ کـــە دڵ دەخـــوازێ

٧٠٦

ئـــەو ڕۆژە لـــە مەحشـــەر کـــۆ وەبـــێ نێـــر و مـــێ

کـــێ ترســـی لـــەوەی نیـــە کەمـــەکی ئێـــروو بـــێ

مـــن لـــوتفی لـــە بـــەر چـــاو دەگـــرم بـــا ئێـــوەش

بـــە ئومێـــدی ئـــەوەی بـــن، ئەگـــەریش خێـــرو بـــێ

٧٠٧

بـــــۆ حــــــاڵی هــــــەژاران وەرە نرخــــــێ دانـــــێ

زاڵـــم کـــە بـــە هـــیچ، قیمـــەتی نرخـــی نـــانێ

نامـــەرد کـــە بـــە هـــیچ نـــاکرێ نـــازی مـــەردان

مـــەردی پـــێ دەوێ، کـــە نرخـــی مـــەردی دانـــێ

٧٠٨

گــەر تاعــەتی خــۆم نــەخش بکــەم سـەر نــانێ
ئــەو نانــە لــە ســەر ســفرە لــە بــەر سـەگ دانــێ
ســەی برســی ئەگــەر ســاڵێ لــە زینــدانا بــێ
پێــی پیســە کــە هــەر بــۆنی بکــا و ســەر دانــێ

٧٠٩

گــوڵزاری دەمــت، هۆیــە کــە گــوڵ بــەر دێنــێ
لێــــوی تــــۆ ژیــــانی ئەبــــەدی بــــەردێنێ
بڕژێنــە کــەمێک لــە ســەر زەوی لــەعلی لێــو
تــا ڕوویــی زەوی ڕووح و گیــان بــەر بێنــێ

٧١٠

ســۆفی لــە ســەماع، بۆیــە دەســی هەڵــدێنێ
تـــا ئـــاگری دڵ، بـــە حیلـــە دامرکێنـــێ
زانــا کــە دەزانــێ دایــە لانکــی ڕۆڵــە
بــۆ خــەوتنی نــاو بێشــکەیە ئــەیڕاژێنێ

٧١١

دڵ تەنگم لە دنیایە ژیانم ناوێ
گەر تۆم نەبێ بۆ چیمە جیهانم ناوێ
بەم حاڵە و بەم دەردە و بە دڵی تەنگم
بێ تۆ هەموو فیردەوس و کیانم ناوێ

٧١٢

خاوەن دڵم بمبەخشە چ پرسی ناوێ
غەرقم لە گوناه و هەڵە پرسی ناوێ
شەرمەندە دەبم ئەگەر بپرسی کارم
ئەی خاوەنی من ڕوحمی تۆ پرسی ناوێ

٧١٣

شەوقت لە دەروونمکە، چ پرسی ناوێ
گیانم کە بۆ تۆ تینووە، پرسی ناوێ
دوو دەستی کە هەمبوو بیخەمە داوێنت
هەر داومە لە سەر لە بەر تۆ، پرسی ناوێ

٧١٤

وەرە بــۆ نێــو ســەفی یــارانی مــە، ترســی نــاوێ
خــاکی بــەری پێــی ئێمەبــە، ترســی نــاوێ
گــەر گشــتی جیهــان هێرشــی گیــانی تــۆ کــا
ئــۆقرەت بەمــە بــێ و، بۆمــە بــە، ترســی نــاوێ

٧١٥

ڕووت کــــردەوە مــــن قبوولّــــە شــــەرمی نــــاوێ
ڕەحمــــان و ڕەحــــیمم وەرە شــــەرمی نــــاوێ
فرمێســـک دەبـــارێنی لـــە شـــەرمی مـــن تـــۆ
پـــێم شـــەرمەکە نەتبەخشـــم و شـــەرمی نـــاوێ

٧١٦

گــــوڵزاری وەفــــا لــــە دڕک و خــــارم دەڕوێ
بــێ فێڵــی لــە ڕەفتــار و لــە کــارم دەڕوێ
دوێ شــەو کــە بــە یــادی تــۆ ســەرم دانــابوو
ئەمڕۆکــــە گوڵــــە، وا لــــە کــــەنارم دەڕوێ

٧١٧

«وصـڵی»تـۆ لـە کـوێ و ویسـتی ئـەبولخیرە لـە کـوێ
دوڕدانــە لــە کــوێ و، تاقــەتی مێروولــە لــە کــوێ
هــەر چەنــد کــە لــە ســووتمان گــەلێ بــێ بــاکم
پەروانــە لــە کــوێ و، ئــاگری ئــەم تــوورە لــە کــوێ

٧١٨

ئـــــەم ژینـــــە دەم و ســـــاتێکی پـــــاکی پێـــــدەوێ
ئــەم بوونــە هــەتا ســەر دڵــی پــاکی پێــدەوێ
وا چاکـــە لـــە ئێســـتاوە بـــە کـــارت ڕاگـــەی
چــوون ئــاخری کــار، مرۆڤــی پــاکی پێــدەوێ

٧١٩

بـــۆ کوشـــتنی مـــن، دوچـــاوی فـــەتتانی دەوێ
مەســـتیش کـــە نـــەبێ، زولفـــی پەرێشـــانی دەوێ
ترســـم لەوەیـــە جەســـتەیی کـــوژراوی مـــن
دوای کوشـــتنی مـــن، عـــوزری لـــە دەســـتانی دەوێ

## ٧٢٠

شـــەیدایی غـــەمت هاتـــە ســـەرم نیـــوە شـــەوێ
دەریـــای دڵـــم مـــەوجی لـــە خـــوێن داوە شـــەوێ
پەیـــدا بـــوو لـــە مـــن خێڵـــی خـــەیاڵی یـــارم
کـــەم مـــابوو گیـــان، لـــە خێمـــە دەرچـــێ لـــە شـــەوێ

❋❋❋❋❋

٢٥

یـــــارەب بـــــە موحەممـــــەد و عـــــەلیی و زەهـــــرا
یـــا ڕەب بـــە حوســـەین و حەســـەن و ئـــالی عـــەبا
بـــەو ڕەحمـــەتی خـــۆت بهێنـــە دی حاجـــاتم
بـــێ مننـــەتی عالـــەم ئـــەی بڵنـــدی ئـــەعلا

٩٩

یـــارەب، مـــن ئەگـــەر گونـــاهی بـــێ حـــەددم كـــرد
گشـــتی هەڵـــە بـــوو هـــەرچی بـــە ناحـــەققم كـــرد
ئێســـتا كـــە لـــە هـــەر كـــارێ دژی مـــەیلـــت بـــێ
هاتوومـــە بڵـــێم، بـــە ڕوو ڕەشـــی تۆبـــەم كـــرد

١١٨

یـــــارەب، بـــــە دوو ئـــــەولاد و نـــــەوەی پێغەمبـــــەر
یـــــانی بـــــە دوو شـــــەمعی خانـــــەوادەی حەیـــــدەر
دۆڕاوە دڵـــــم، تـــــۆ بەكـــــەرەم ســـــەیرم كـــــە
چـــاوم لەوەیـــە بمخەیـــە ژێـــر چـــاوی نـــەزەر

١٧٠

یارەب بە عەلی ئیبنی ئەبی طالب و ئال
ئەو شێری خودا و خاوەنی ویژدان و کەمال
فریام بکەوە لە سێ مەکان و سێ شوێن
کاتی سەرە مەرگ و گۆڕ و هەم کاتی سوئال

٢١١

یارەب، بکەوە گرێ لە حاڵی زارم
ڕوحمێک، کە عەقڵ عاجزە بۆ هەرکارم
دەرگاهت نەبێ دەرگەیەکی شک نابەم
ئەم دەرگە لە ڕووم پێوە نەدەی، غەففارم

٢٢٩

یارەب، ئاوڕم لێدەوە سەرگەردانم
ئالوودە بە دەس نەفس و هەوەس دامانم
کارێکی نەکەی شایەنی تۆڵەی من بێ
داپۆشە بە لوتف و کەرەمت تاوانم

## ٢٣٩

یارەب، من بە یەکبوونی تۆ ئیمان دێنم
ئیمان بە خودای عالەم و حەیوان دێنم
وشک و تەڕی دنیایە هەر ئەو دوەم لایە
دوو لێوی وشک، چاوی بە گریان دێنم

## ٢٤٥

یارەب، لە هەڵان و لە تەڵان ئاڵاوم
ئەی خوایە لە ژێرباری گوناهان ماوم
نوورێک بۆ دڵم لە عالەمی پاکی ڕا
بڕژێنە سەرم لە ژێر غەمان تاساوم

## ٢٤٦

یارەب، لە دەسی نەفسی گڵاوم ماوم
یارەب، لە قسە و کاری خراپم ماوم
ڕوحمم پێ بکە ئێستە گەلێ موحتاجم
ئێستا بە دڵ و دەستی شکاوم ماوم

٢٦٥

یارەب، کەسی من تۆی و لە کەس ڕوو ناکەم
بۆ هەرکەسی کەس، کەس بە کەسی تۆ ناکەم
لوتف و کەرەمت ڕیشی منی چەرموو کرد
بەم مووییی سپی بێجگە لە تۆ ڕوو ناکەم

٢٨٠

یارەببی عیلاجی بە پەلەی بیماران
ئەی ڕۆزی دەر و خاوەنی بەفر و باران
لێو وشکی بیابانی هەژارین ئێمە
بۆ دێمی ئومێدی مە بڕێژی باران

٢٨٨

یارەب، لە تەرەف تۆوە عیلاجێک بۆمان
بۆ نمروودەکان پێشوولە فیلێک بۆمان
فیرعەونی زەمان ڕوحمیٚ بە خەڵکی ناکا
مووسا وو عەسا وو چەمی نیلێک بۆمان

٢٨٩

یـــــارەب ســــــەبەبی ژیـــــانی حــــــەیوان بۆمـــــان
لـــــە خـــــوانی کــــەرەم نیعمــــەتی ســــامان بۆمــــان
بـــۆ لێـــوی کـــزی ســــەوزە گیــــای نــــەو ڕەســــتە
لــــەم هـــــەورە ڕەشــــە ڕێژنــــــەیی بـــــاران بۆمــــان

٣٥٠

یــــارەببی لـــــە بـــــەر خــــاتری فـــــەخری (ثَقَلَـــــــــین)
ئــــەی خوایـــــە لــــە بـــەر ڕێــــزی شــــەهیدانی حونــــەین
تــــاوانم بــــــە دوولەتکـــــــە، لــــــە ڕۆژی قیامـــــــەت
نیـــوەی بـــــە حەســـــەن ببەخشــــە نیـــوەی بـــــە حوســــەین

٣٩٢

یـــارەب، لــــە دوو عالـــــەم بـــێ نیـــــازم بکـــــە تـــــۆ
بــــــەم تــــاجی هـــــەژاری، ســــــەرفرازم بکـــــە تـــــۆ
بـــۆ ڕێگــــــەیی تـــۆ، مـــــەحرەمی ڕازی تـــۆ بـــــم
لا ڕێ بـــم لــــە هــــەر کـــارێ بـــــە حـــالْم بگـــە تـــۆ

٤٥٧

یارەب، دڵی من بە غەیری خۆت مەسپێرە
دێمەی دڵەکەم بە ئاوی خۆت بیدێرە
پێم وت، پێم وت، هیچ لە دەستم نایە
ڕوحمم پێ بکە، دڵم بە خۆت بسپێرە

٤٧٤

یارەب، وەرە ڕوحمێکی بکە و شادم کە
ناڵەی دڵی من کۆکەوە هەمڕازم کە
ئەوکەس کە ئەمن لە تاوی ئەو غەمبارم
ئەو بە من و بە دڵ، پێکەوە دەمسازم کە

٤٧٥

یارەب، بە کەرەم سەیری گوناهانم کە
ڕوحمێک بە منی ماندوو، لە ئامانم کە
وام پێمەکە، وەک ئەوەی من کردم
تۆ ڕوحمێ بە حاڵ و سەر و سامانم کە

٤٧٩

یارەب، بە کەرەم چاوێ لە عەبدی خۆ کە
چاوێک لە من و چاو لە بڵندی خۆ کە
هەر چەندی کە نیم، لاییقی بەخشینی تۆ
رەحمێکی بە من، لە بەر خودایی خۆ کە

٤٨١ (دوعا بۆ کوڕەکەی)

یارەب، لە خەوی نازەوە بیداری کە
لەو مەستی جووانی بەسە هوشیاری کە
یا بێ خەبەری کە، کە نەزانێ کێیە
یا نا، تۆ لە حاڵی خۆ خەبەرداری کە

٤٩٥

یارەب، بە کەرەم نەکەی پەرێشان ئێمە
داهاتووە پشتن لە گوناهان ئێمە
زاتی تۆ غەنی و، ئێمە هەموو موحتاجین
ئاتاجی بە تۆ بین نە بە خەڵکان ئێمە

٥١١

یارەب، چ خودایێکی جەماڵت جوانە
ڕازیمە بە فەرمانت و کارت جوانە
ئەو خەڵکە دەڵێن بەهەشت دەخوازی یا ئەو
چەند بێ خەبەرن بەهەشتی چاوت جوانە

٥٥٣

یارەب، غەمی غەیری تۆ لە کارم دایە
بێ سوودی لە سوودی منە ئەم سەودایە
شەرمێ دەکەم بەم کارە لە دەرگاهی تۆ
پاکی کەوە ئەم نەنگە لە حاڵم دایە

٥٥٤

یارەب، غەمی غەیری تۆ کە لە دڵم دایە
پاکی کەوە وەک سیخە لە جەرگم دایە
پێویستە لە سەرمن هەموو دەم یادی تۆ
بۆ چاکە وو لوتفی تۆ کە لە ملم دایە

٦٠٣

یارەب، یارەب، کەریم و هەم غەففاری
ڕەحمان و ڕەحیم و ڕاحیم و سەتتاری
داوامە بە ڕەحمەتی خوداوەندی خۆت
ئەم بەندەیە شەرمەندە نەکەی یەکجاری

٦٤٤

یارەب، لە قەناعەت سەر و سامانم دەی
تاریک بووە دڵ، هاتوومە دەرمانم کەی
ڕزقی منی سووتاوی غەم و دەردی تۆ
بێ منەت لە خەڵک هەر تۆ لە گیرفانم خەی

٦٥١

یارەب، لە تەواوی کەرەمت خاسم کەی
هوشیاری بە کردەوە و خوداناسم کەی
لەو عەقڵە جەفاکارە سەرم شێواوە
دێوانەیی خۆتم کەی و ڕزگارم کەی

پێزانین:

سوپاسی بەڕێز مامۆستا مەلا (حوسێن شێخانی) دەکەم کە مامۆستایەکی ئەدیب و عارف و شاعیرە و ئێستا لە تەمەنی ٧٩ ساڵی دایە، بەڵام شوکر بۆ خودا ساغ و سلامەتە و زەحمەتی کێشا و پێداچوونەوەی مەعنایی لە چوارینەکاندا کرد، وە زۆر هەڵەی مەعنایی و قافیەی بۆ ڕاست کردمەوە. ڕۆژێک کە لە گەڵ (مەلا عبدالباسط برهانی) لە خزمەتی دابووین ئەم شێعرە فارسیەی خوارەوەی کە نازانم هی کێیە، زۆر بە هەست و سۆزێکی عارفانە خوێندەوە وە منیش شێعرەکەم بەم شێوە کردە کوردی:

*دل را به جز با یاد خدا شاد مکن - با یاد وی از کس دیگری یاد مکن*

*دل خانه ی کعبه است ویران مگذار - ویرا به جز از یاد وی آباد مکن*

**کوردی**

بۆ غەیری خودا ئەم دڵە قەت شاد مەکە
یادی لە دڵت بۆ کەسی بەر باد مەکە
وەک کەعبەیە دڵ حەیفە کە وێرانی کەی
بۆ ئەو نەبێ ئەم کەعبەیە ئاباد مەکە

❋❋❋❋

دواتـــر مامۆســـتا ئـــەم چەنـــد دێـــڕەی خـــوارەوەی نووسی و فەرمووی با لات بێ.

(بەڕێز مەلا ئەســعەد شــەرافەت ا سعدک الله، لە خوای میری مەزن داوای ســەرکەوتنت بۆ دەکەم هیوادارم بە سەر مەبەستەکانت دا زاڵ بی، بە تایبەت وەرگێڕانی چوارینەکانی (شیخ ابو سعید ابوالخیر) کە یەکێك لە عارفانی سەدەی ٤ ـــــ ٥ ی خوڕاسانە، کە تا ئێستا نەبیسراوە کەس خۆی لێدابێت بۆ وەرگێڕان، هەر بۆیە کارەکەی تۆ جێگای شانازییە بۆ عیرفان و ئەدەبیاتی کوردی کە ئەدیبێکی ئاوای لێهەڵکەوتووە کە دەتوانێت خۆی لە قەرەی ئەو کەڵە پیاوە عارفە بدات و چوارینەکانی بە شــێوەی خۆی بخاتە ســەر زمان و ئەدەبیاتی کوردی، بۆیە کارەکەت جێگای ڕێز و ســوپاس و پیرۆزباییە. لە خوای گەورە و میهرەبان داوای ســــەرکەوتنی زیاترت بۆ دەکەین.

ومن الله التوفیق.

حسین محمد امینی(شێخانی)

١٥ی ڕێبەندانی١٣٩٦ی هەتاوی

*****